# جەلادەت عالی بەدرخان

## لەبارەی کێشەی کوردەوە

## سەبارەت بە یاسای دوورخستنەوەو بڵاوەپێکردنی کوردان



لە تورکییەوە وەرگێڕانی

زریان ڕۆژهەڵاتی

جەلادەت عالی بەدرخان
"هەرەکۆل ئازیزان"

# لەبارەی کێشەی کوردەوە

## سەبارەت بە دوورخستنەوەو بڵاوەپێکردنی کوردان

وەرگێڕ
زریان ڕۆژهەڵاتی

بنکەی ژین
سلێمانی ٢٠٠٦

٩٥٦,٤٦
ب ٢٨٢ بەدرخان، جەلادەت عالی.
لەبارەی کێشەی کوردەوە: سەبارەت بە دوورخستنەوەو بڵاوەپێکردنی کوردان / نووسینی جەلادەت عالی بەدرخان، لە تورکییەوە وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەڵاتی. – سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٦.
ل، ١٤,٥ × ٢٠,٥ سم.
١– کوردستانی تورکیا– مێژوو ئ– ڕۆژهەڵاتی، زریان (وەرگێڕ)
ب– ناونیشان
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتایی پێڕستو پۆلێنی ئامادە کردووە

سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

زنجیرە: ٣٢
کتێب: لەبارەی کێشەی کوردەوە، سەبارەت بە دوورخستنەوەو بڵاوەپێکردنی کوردان
نووسەر: جەلادەت عالی بەدرخان
لە تورکییەوە وەرگێڕان: زریان ڕۆژهەڵاتی
تایپ: بەیان محەمەد عەبدوڵڵا
مۆنتاج: ڕێنوار
بەرگسازی: قادر میرخان
خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید
تیراژ: ١٠٠٠
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان
ژمارەی سپاردن: ٢٢٩ی ساڵی ٢٠٠٦

لە بڵاوکراوەکانی
بنکەی ژین
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستانی عیراق– سلێمانی، گەڕەکی ١٠٤ ئاشتی، کۆڵانی٣٩، خانووی ژمارە ١٠،
(بەرامبەر بە قوتابخانەی سەرەتایی ئەردەڵان)
تەلەفۆن: ٣١٣٣١٠٥ مۆبایل: ٠٧٧٠١٤٨٤٦٣٣ یان ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ ژمارەی سنووقی پۆست: ١٤
E.mail: bnkaizhin@ yahoo.com

وەرگێڕانی ئەم کتێبە
پێشکەشە بە هاوڕێی خۆشەویستم
"دیجلە"

# جەلادەت عالی بەدرخان

سالّی ١٨٩٣ لە ئەستەمبوولّ لەدایك بوو و، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیشی هەر لەوێ تەواوکرد. کاتی شەڕی یەکەمیجیهانی، لەنێو ڕیزەکانی سوپای عوسمانیدا، لە جەبهەی قەفقاسیا جێگەی خۆی گرت و، دوای ڕووخانی ئیمپڕاتۆریای عوسمانی کەوتە ناو هەوڵ و تەقەلای یەکخستنی خێڵە کوردیەکان. سالّی ١٩٢٢ لەگەڵ کامەران بەدرخانی برایدا دەربازی ئەڵمانیا بوو. لەوێش، سەرەڕای هەموو زۆری و زەحمەتییەك خوێندنی خۆی درێژە پێدا. سالّی ١٩٢٥ چووە قاهیرە و، دواتریش لە سووریا نیشتەجێ بوو.

لە سووریا، لەگەڵ حاجۆ ئاغا و ڕۆشنبیرە ناودارەکانی کورددا، ڕۆڵێکی چالاکانەی لە دامەزراندنی ڕێکخراوی (خۆیبوون)دا گێڕا. دوو گۆڤاری کوردیی بە ناوی "هاوار" و "ڕۆناهی"یەوە دەرکرد. دوای ماوەیەکی کورت "هاوار"ی بە پیتی لاتینی دەرکرد. لە ١٥ی تەمووزی سالّی ١٩٥١دا لە شام چاوی بەڕووی دونیادا بەست.

هەموو بەرهەمەکانی جەلادەت عالی بەدرخان، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

- یادداشتی ڕۆژانە (١٩٢٥-١٩٢٢)، ئامادەکردنی مالمیسانژ.
- سەبارەت بە کێشەی کورد(تورکی- فەڕەنسی) Dela Questin Kurde
- وەرە دۆتمام. شیعرەکانیەتی Were Dotmam.

- زەلامەك‌و زمانەك"Zilamek û zimanek" نووسراوەكان.

- بنگـەهێن گرامێـرا كوردمـانجی- (كـوردی-تـوركی). Bingehên Gramera Kurdmanc.

# یاسای دوورخستنەوەو بڵاوەپێکردنی کوردان

ئـەم یاسـایە لەلایـەن حکوومـەتی کۆمـاری تورکیـاوە دەرکـراوەو، دەرکردنی کوردان لە خاکی کوردستان و جێگیرکردنـی تورکـەکانی تێدا کـراوە بـە ئامـانج. بـەم شـێوەیەش، بەتێپـەڕبوونی سـەدان سـاڵ، ئـەو کوردانـەی وا لـە شـوێنی لەدایکبوونی خۆیـان دوورخراونەتـەوەو لـەنێو تورکەکانـدا پـەرش و بڵاوبـوون، وردە وردە زمـانی دایکـی خۆیـان فـەرامۆش دەکـەن و یاسـاو ڕێـساو کولتـووری خۆیـان لەدەسـت دەدەن و لەنێو تورکەکاندا دەتوێنەوەو دەبن بە تورك.

١٩٣٤

لە ڕادیۆو... بەشێوەیەکی بەردەوام هەواڵی وەکوو:

تورکـەکان و ئێرانیـەکان و عیراقیـەکان لـە سـنوورە هاوبەشـەکانی خۆیانـدا بـەدوای یـاخی و چـەتە کوردەکانـدا دەگـەڕێن، دادگـای سەربەخۆیی تورکیا زیاتر لە دەیان کوردی سەرهەڵداوی مەحکووم بە ئیعدام کردو ... هتد، پەخش دەکەنەوە.

کەواتە کێشەیەك بەناوی کێشەی کوردەوە لەئارادایـە. ئـەم کێشـەیە چـییەو سەرچـاوەکانی کامانـەن ؟ ئامـانجی سـەرەکیی سـەرکردە کوردەکان چییە ؟

Locient ,١ی ئەیلوولی ١٩٣٤

بێگومان کێشەی کورد هەبوەو هەتاکوو کوردی کۆیلەکراو لەسەر زەوی بمێنێ، بەردەوام دەبێ.

کێشەی کورد لە قۆناغێکی نزیکەوە دەرنەکەوتووەو شتێکی تازە نییە، دوێنێ و چەند ساڵ بەر لە ئەمڕۆ پەیدا نەبوەو، ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدان ساڵ بەر لە ئێستاو، بە هیچ جۆرێك ڕووی چارسەری بەخۆوە نەبینیوە.

مێژووی ئەم کێشەیە، لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا، تەنیا لەلایەن هەندێك ڕۆژهەڵاتناس و گەشتیارەوە پێدەزانرێ، کە لە وڵاتەکەماندا گەڕاون و زانیاریی باشیان لەو بارەیەوە بەدەست هێناوە.

لەبەر بارودۆخی جوغرافیای وڵاتی کوردان، تەنیا لەدوای شەڕی جیهانییەوە توانراوە وەکوو کێشەیەکی ناونەتەوەیی، باس لە کێشەکەیان بکرێت. شەڕی جیهانی بوو بە هۆی دابەشبوون و ڕووخانی ئیمپڕاتۆریای عوسمانی و هەلی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی بۆ ئەو نەتەوانە ڕەخساند کە لەڕاستیدا پێکهاتەی ئیمپڕاتۆریاکەیان دروست کردبوو.

مەبەستی سەرەکیی ئەم بابەتە دەرخستنی ناوەڕۆك و شیکردنەوەی یاسای دوورخستنەوەی کوردانە کە لە (٥ی مایسی ١٩٣٢)دا بەشێوەیەکی فەرمی ڕاگەیەندراوە. هەروەها لەبەر ئەوەش کە حکوومەتی تورکیا بە نیازە لە ماوەیەکی کورتدا ئەم یاسایە جێبەجێ بکات، بەشێوەیەکی کورتیش باس لە قۆناغە مێژووییەکانی کێشەی کورد دەکەین.

یەکەم ڕێکخراوو کەسایەتیە سیاسیەکانی کورد خۆی لە خۆیدا دوای شەڕی جیهانی، لەڕێگەی کتێب و بابەتەکانیانەوە بە زمانی جۆراوجۆرو لە

ڕۆژنامەی جیاوازدا هەوڵی ناساندنی کێشەی کوردیان داوە. هەر لەبەر ئەمەش، ئێمە بەر لەوەی بچینە سەر باسی سەرەکیی خۆمان سەبارەت بە ڕیشەی کێشەی کورد، تەنیا ئاماژە بە چەند خاڵی پێویست دەکەین.

وڵاتی کوردان هەتاکوو یەکەم شەڕی جیهانی بەشێوەیەکی بنچینەیی لەنێوان تورکیاو ئێراندا دابەش کرابوو. دەستەواژەی "کوردستانی عێراق" و"کوردستانی سووریا"، لەدوای ڕووخانی ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە، وەکوو بەرهەمە تازەکانی شەڕی جیهانی، هاتنە ئاراوە. بەڵام کوردەکانی قەفقاسیا، بەر لە شەڕی جیهانیش هەر لەژێر دەسەڵاتی ڕووسەکاندا بوون.

وەك ئەنجام دەتوانرێ لە کوردستانی تورکیاو ئێراندا، لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە سەرچاوەکانی کێشەی کورد ئەنجام بدرێ. وەك دەزانرێ، حکوومەتی ئێران تاوەکوو ئەم ساڵانەی دواییش توانایی و هێزی سەرکوتکردنی سەرهەڵدانی میرە کوردەکانی نەبوو و، نەیدەتوانی دەسەڵاتی خۆی بەسەریاندا بسەپێنێ. بەپێچەوانەوە، میرەکانی ئەردەڵان بۆ چەندین جار هەڕەشەی لەناوبردنی تەختی دەسەڵاتی پادشاکانی تارانیان کردبوو، لەدواییدا حکوومەتی تاران تەنیا بەڕێگەی فێڵ و تەڵەکە توانیی ئەو میرنشینە بڕووخێنێ.

پادشاکانی تاران بۆ گەیشتن بەم ئامانجەیان، تا ئاستی تێکەڵیی بنەماڵەیی، هەوڵی دروستکردنی پەیمانی هەمەجۆریان لەگەڵ میرەکانی ئەردەڵاندا دابوو. دایکی میرەکانی ئەردەڵان، کە هەمان شازادەکانی

کۆشکی تاران بوون، لە کۆشکی سینانەدژ[1] (سنە) بەردەوام تەقەلای بەجێهێنانی فەرمانەکانی باوکی پادشایان لە تاران دەداو، لەدواییشدا ئەرکەکانیان بە سەرکەوتوویی ئەنجام دا. بەر لەوەی ئەم شازادانە بچنە ناو کۆشکی میرەکانی ئەردەڵان، میرە کوردەکان هیچ ئاگایان لە ماددە سڕکەرەکان و خواردنەوە ئەلکولیەکان نەبوو کە ئەو سەردەمە لە ئێراندا بەشێوەیەکی فراوان بەکاردەهێنران.

پەیوەندیی هاوسەریی و تێکەڵیی بنەماڵەیی میرەکانی ئەردەڵان لەگەڵ پادشاکانی تاراندا، تەنانەت کاریگەریشی لەسەر بیروباوەڕی میرە کوردەکان دانا" ئەمانە بە پێچەوانەی هەم کەش و هەوای فاناتیزمی دینیی سونەگەرایی ئەو سەردەمەو، هەم بیرو بۆچوونی خەڵکی ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، مەزهەبی شیعەیان پەسند کرد. ئەمەش لە پێوانێکی گەورەدا بوو بە هۆی ئەوەی کە ئاستی قورسایی و کاریگەریی ئەمانە لەنێو خەڵکدا کەم ببێتەوە[2] ؟

---

[1] ساناندژ، پایتەختی میرنشینی ئەردەڵان بووە. ئەم ناوە وشەیەکی لێکدراوی کوردییە، لە "سانان"و"دژ" پێك هاتووە. "سان" بە واتای لوتکەی چیایەو ناسناوی میرە کوردەکانەو واتای شازادەش دەدات. "دژ"یش واتای قەڵا دەدات. یانی ساناندژ دەبێ بە قەڵای شازادە یاخود میرەکان. ئەمڕۆ ئەم ناوە بەشێوە کورتکراوی "سنە" بەکاردەبرێت و، شارەکەش ناوەندی بەڕێوەبەرایەتیی کوردستانی ئێرانە (ڕۆژهەڵاتی کوردستان).

[2] سەرەڕای ئەوەی کە هەردوکیان موسڵمانن، بەڵام ناکۆکییەکی قووڵ لەنێوان شیعەو سوننەدا هەیەو شیعە، سوننە بە ناموسڵمانێکی دوورتر لە خۆی لە قەڵەم دەدات، ئەمەش تا ئەو جێگەیەی پەرەی سەندووە کە ئەگەر سوننەیەك ئاو لە

ئێرانی ئەمڕۆش، بەتایبەتی لە دوای هاتنە سەرکاری ڕەزاشای پەهلەوییەوە، زیاتر لەوەی کە لاسایی‌ی تورکیای مستەفا کەمال پاشا بکاتەوە، هیچ شتێکی‌تر ناکات. هەموو بەگزادەکانی کوردستانی ئێرانیان لە ولاتی خۆیان دوورخستەوەو، ناچاریان کردن هەتا کۆتایی‌ی تەمەنیان لە پایتەختی ئێران بمێننەوە.

لەلایەکی‌تریشەوە، لە هەر هەلومەرجێکدا کە هەوڵی کۆکردنەوەی چەك و تەقەمەنی‌ی کوردەکانیان دەدا، هەر جۆرە ڕێکخراوێکی کۆمەلایەتی، ئەدەبی، ئابووری‌ی کوردی قەدەغە کرابوو. هەروەها هاوردنی پلاکی کوردی‌و: [پەلێکی لاستیکی کە بۆ گوێگرن لە گرامافۆن بەکاریان دەهێنا] بۆ ناو خاکی ئێران، بە هەموو جۆرێك قەدەغە بوو. لەلایەکی‌تریشەوە، هەروەك چۆن لە تورکیا بۆ ئەوەی باس لە کێشەی کوردان نەکرێت، کوردەکان وەکوو "تورکی چیایی" ناوزەند دەکرێن، لە ئێرانیش بەهەمان شێوە وەکوو "ئێرانیە چیاییەکان" ناو دەبرێن. دەوڵەتی ئێران، بەقەدەر دەوڵەتی تورکیا، خۆی ڕێك نەخستووەو لەو بارەیەوە پێش نەکەوتووەو، لەبەر ئەوەی متمانەی بە (سوپا تازە دروستکراوە)کەی نییە، وەکوو تورکیا کوردەکان ناچاری کۆچی بەکۆمەڵ ناکات‌و ستەمی ئاشکرایان لێ ناکات.

لەبەر ئەوەی یاسای دوورخستنەوەی کوردان لە تورکیا دەرکراوەو دژ بە کوردەکانی ئەوێیە، باسی وردەکاری‌ی تر ناکەین‌و، یەکسەر

---

پەرداخی شیعەیەکدا بخواتەوە، کەسی شیعە لەو بڕوایەدایە پەرداخەکە بە شۆردن پاك نابێتەوە، بۆیە بۆ ئەوەی خۆی‌و شیعەیەکی تر پیس نەبێ، پەرداخەکە دەشکێنێ.

دەچینە سەر باسی بابەتی کێشەی کورد لە تورکیاو لە چۆنیەتی دەرکەوتنی کێشەی کوردان کە سەدان ساڵە لەژێر دەسەڵاتی تورکیدان، دەدوێین.

سەرەتای سەدەی ١٦ میرە کوردەکان بەبێ شەڕو بە ویستو داخوازی خۆیانو بۆ پاراستنی دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی خۆیان، بەپێی پەیمانێکی دوولایەنە، سەروەریی دەسەڵاتی سوڵتانە تورکەکانیان قەبووڵ کرد. ساڵی ١٥١٤و لەگەڵ شەڕی سوڵتان سەلیمی یەکەمدا دژی شای ئێران، کوردەکان بەپێی هەلومەرجی سەپێندراو لە دووڕێیانی هەڵبژاردنی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای تورکی یاخود ئێرانیدا مانەوە.

سەرەڕای ئەوەی کە هەردوکیان ئاریایین و ڕیشەیەکی نەژادیی هاوبەشیان هەیە، بەڵام کوردو ئێرانیەکان پێکەوە نەگونجانو نەگەیشتنە ئەنجامێك. کوردەکان سوننە بوونو ئێرانیەکانیش شیعە، هەر لەبەر ئەمەش ڕێك نەدەکەوتن. ئەم سەردەمە، هەستە دینیەکان لەنێو هەموو گەلاندا لە سەرووی هەموو هەستەکانی ترەوە بوونو زیاتر بایەخیان پێ دەدرا. لە ئەنجامدا میرە کوردەکان بڕیاری وابەستەیی خۆیان بە سوڵتانی سوننەی تورك سەلیمی یەکەمەوە ڕاگەیاند. شایانی باسە، پادشای ئێرانیش شایەکی موسڵمان بوو، بەڵام تەنیا جیاوازیەکەی ئەوە بوو کە شیعە بوو.

هەر لەدوای ئەمەوە، کێشەیەك بەناوی کێشەی کوردەوە لە ساڵانی دەسەڵاتداریی ئیمپراتۆریای عوسمانیدا خۆی نیشان دا. جێی وتنە، بەپێی جیاوازیی قۆناغەکانو چەمکی تایبەت بەوانە، لەم کێشەیەشدا جیاوازی لە ئاستی فۆرمو ناوەڕۆکدا بەدی دەکرێ.

کێشەی کورد، جاروبار نموونەی جووڵانەوەیەکی فیودالّیی تایبەت بە خۆی پێشکەش دەکات و، جاروباریش لە قۆناغە جیاوازەکانی حکوومەتی ئیمپراتۆریای عوسمانیدا فۆرمی تێکۆشانێکی دینی نیشان دەدات. لەم وەزعەی دواییدا کە زۆر نابێ بە هۆی ئاژاوەو گرژییەکی قووڵ، بابەتی ناکۆکیی حەنەفی و شافیعیەکان لەئارادا بووە. لەکاتێکدا حەنەفی بوون نیشانەی تورکایەتی بوو، لە تەواوی ئەنادۆڵدا بەس بە تەنیا کوردەکان شافیعی بوون. دوای ماوەیەکی تر، خێڵە کوردەکان ئاگاداری ئەوە دەبنەوە کە سەربەخۆیی و ئازادییان بە ئەندازەی خودی ژیان بەهادارە بۆیان و، هەر لەبەر ئەوەش بەرامبەر بە دەسەلاتی تورکی قۆناغێکی سەرهەڵدانیان دەست پێکرد.

لە ڕۆژی ئەمڕۆشماندا ئامانجی نەتەوەیی کە کاراکتەری ئەم سەدەیەیە، بووە بە سیمای جووڵانەوەی کوردی. شایانی باسە، ئەم لایەنەی جووڵانەوە کوردیەکان، شتێك نییە لە ماوەیەکی کورتدا دەرکەوتبێ و، ڕابردوویەکی خۆی هەیە. بۆ نموونە، داخوازیی نەتەوەیی هەر لەزووەوە لە ئەدەبیاتی کوردیدا پێشکەوتبوو، سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدە. ئەویڕاستیبێ ئەحمەدی خانی کە لە ساڵی ١٠٦١ی کۆچیدا لەدایك بووە، یەکەمین پێشەنگی ڕاستەقینەی ناسیۆنالیزمی کوردی بووە. بابەتی بەرهەمەکەی (مەموزین) ناوەڕۆکێکی نەتەوەیی هەیەو، تەنیا باسی کوردایەتی و کوردستان دەکات. قارەمانەکانی ناو (مەموزین) سەمبوڵن. ئەو قارەمانەی وا سەمبوڵی کوردستانە، بەبەندکراوی دەهێنێتە پێش چاوی

خوێنــەرو وەهــا نیــشان دەدات کــە هاوڕێکــانی هــەوڵو تەقەلایــەك بــۆ ئازادکردنی ئەو قارەمانە دەدەن [٣] .

---

[٣] لێرەدا سەبارەت بە ڕوشنبیرێکی کوردو ئامۆژگاریەکانی لەسەر کوردایەتی، لەکاتێکدا کە بیری نەتەوایەتی لە ئەوروپاشدا بەتەواوەتی گەشەی نەکردبوو، بۆچوونێك دەدەین بەدەستەوە. جێی باسە ئەم ڕۆشنبیرە تەنیا لە قوتابخانەدا پەروەردەی بینیوە، کەچی سەرەڕای ئەوە بۆچوونی وەهای پێش چاو خستووە. ئەمەی وێڕای بوونی خەلیفایەتیو فاناتیزمی دینی کردووەو، بە گرێدانێکی پیرۆزەوە پەیوەندیی داوە بە دەسەڵاتداری کوردەوە.

لێرەدا وەرگێڕدراوی شیعرێکی شاعیر (ئەحمەدی خانی) لەسەر بارودۆخی کوردانو خەفەتەکانی لەبەر ئەوە دەهێنینەوە:

قەط مومکینە ئەڤ، چەرخ لەولەب
طالع ببتن ژ بۆ مە کەوکەب
بەختێ مە ژ بۆ مەرا ببت یار
جارەك ببتن ژ خواب هشیار
ڕابت ژ مە ژی جهانپەناهەك
پەیدا ببتن مە پادشاهەك
شیرێ هونەرا مە بێتە دانین
قەدرێ قەلەما مە بێتە زانین
دەردێ مە ببینتن عەلاجێ
علمێ مە ببینتن ڕەواجێ
گەر دێ هەبوا مە سەرفەرازەك
صاحبکەرەمەك، سوخەنەوازەك
نەقدێ مە دبوو ب سککە مەسکووك
نەدما وەهە بیڕەواج و مەشکووك

هەرچەند کو خالّص و تەمیزن

نەقدێنێ ب سککەئێ عەزیزن

گەر دێ هەبوا مە پادشاهەك

لائق بدیا خودێ کولاهەك

تەعیین ببووا ژ بۆ وی تەختەك

ظاهر ڤە دبوو ژ بۆ مە بەختەك

حاصلّ ببووا ژ بۆ وی تاجەك

ئەلبەتتە دبو مە ژی ڕەواجەك

غالب نەدبوو ل سەر مە ئەڤ، ڕووم

نەدبوونە خەرابەیێ د دەست بووم

ئەمما ژ ئەزەل خودێ وەسا کر

ئەڤ، ڕووم و عەجەم ل سەر مە ڕاکر

تەبەعییەت وان ئەگەر چ عارە

ئەو عار ل خەلقێ نامدارە

نامووسە ل حاکم و ئەمیران

تاوان چییە شاعر و فەقیران

لەوڕا کوو جهان وەکی عەرووسە

وی حوکم ددەست شیرێ ڕووسە

لێ عەقد و صەداق و مەهر و کابین

لوطف و کەرەم و عەطا و بەخشین

پرسی ژ دنێ من ئەو ب حیکمەت [لەنێو کورددااندا پیاو شیربایی دەدات- ج-ع-ب]

مەهرا تە چ، گۆتە من کو هیممەت

ئەز مامە د حیکمەتا خودێدا

کرمانج د دەولەتا دنێدا

ئایا ب چ وەجهی مانه مەحرووم
بیلجوملە ژ بۆ چ بوونە مەحکووم
وان گرت ب شیری شەهر شوهرەت
تەسخیر کرن بیلاد هیممەت
هەر میرەکێ وان ب بەذل حاتەم
هەر میرەکی وان ب ڕەزم ڕۆستەم
ب فکر ژ عەرەب حەتتا ڤە گورجان
کرمانج چ بوویە شەبیهێ بورجان
ئەڤ، ڕوومو عەجەم ب وان حەصارن
کرمانج هەمی ل چار کنارن
هەردوو طەرەفان قەبیلێ کرمانج
بۆ تیرێ قەضا کرینە ئامانج
گۆیا کو ل سەرحەدان کلیدن
هەر طائیفە سەددەکن سەدیدن
ئەڤ، قولزوومی ڕوومو بەحر تاجیك
هندی کو بکەن خرووج و تەحریك
کرمانج دبن ب خوون مولەطەخ
وان ژێك ڤەدکەن میثالی بەرزەخ
جوامێری و هیممەت و سەخاوەت
میرێنی و غیرەت و جەلادەت
ئەو خەتمە ژ بۆ قەبیلێ ئەکراد
وان دانە بە شیر هیممەتێ داد
هندی ژ شەجاعەتێ غەیوورن
ئەو چەند ژ مننەتێ نفوورن
ئەڤ، غیرەت و ئەڤ علوو هیممەت

بوو مانعێ حەملێ بارێ مننەت

لەو پێکڤە هەمیشە بێ تفاقن

دائیم ب تەمەڕڕودو شقاقن

گەر دی هەبوا مە ئیتیفاقەك

ڤێکرا بکرا مە ئینقیادەك

ڕوومو عەرەبو عەجەم تەمامی

هەمیان ژ مەڕا دکر غولامی

واتای گشتیی شیعرەکە، بارودۆخی دەروونیو خەمو ئازارەکانی شاعیر دەخاتە ڕوو. لەم شیعرانەوە ئەوە باش دەردەکەوێ کە "خانی" نەیویستووە کوردان بە شیعرەکانی خۆی هان بدات بۆ ئامانجی کۆیلەکردنی نەتەوەکانی تر. ئەو شتەی کە کوردان لەپێشەوە داوایان کردووەو ئێستاش دەیانەوێ، ئەوە نییە کە بەسەر چارەنووسی ئەمو ئەودا زاڵ بن، بەڵکوو تەنیا ویستویانە مافی چارەنووسنی پاراستنی بوونی خۆیان هەبێ.

خانی، بە سادەییو خاکیبوونێکی تایبەت بە شاعیرە ڕۆژهەلاتیەکان، لە بەرهەمە سەرەکیەکەی خۆیدا، یانی "مەموزین" باسی ئەو هۆیانە دەکات کە ئیلهامی لێ وەرگرتوون. ئەمە لە نموونەی خوارەوەدا بەرچاو دەکەوێ:

خانی ژ کەمال بێ کەمالی

مەیدانا کەمالێ دیت خالی

یەعنی نە ژ قابلو فەقیری

بەلکێ ب تەعەصوبو عەشیری

حاصڵ ژ عیناد، ئەگەر ژ بی‌داد

ئەڤ، بیدعەتە کر خیلافێ موعتاد

صافی شەمراند ڤەخوار دوردی

مانەند دوڕڕی لیسانی کوردی

ئینایه نیظام و ئینتیظامی

کێشایه جەفا ژ بۆیی عامی

دا خەلق نەبێژتن کو ئەکراد

بێمەعریفەتن ب ئەصڵ و بونیاد

ئەنواع میلەل خودان کتێبن

کرمانج تنێ د بێحەسێبن

هەم ئەهل نەظەر نەبێژن کو کرمانج

عەشقی نەکرن ژ بۆ خوە ئارمانج

کرمانج نە پڕ د بێکەمالن

ئەمما د یەتیم و بێمەجالن

بیلجوملە نە جاهل و نزانن

بەلکی د سەفیل و بێخودانن

خانی، لە شوێنێکدا کە باسی بەرهەمە ڕەمزییەکەی دەکات، ئەمانە دەنووسێ:

شەرحا غەمێ دل بکەم فەسانە

زینێ و مەمێ بکەم بەهانە

نەغمێ وە ژ پەردەیێ دەرینم

زینێ و مەمێ ژ نوو ڤەژینم

دەرمان بکەم ئەز ئەوان دەوا کەم

وان بێمەدەدان ژ نوڤە راکەم

شاعیر کاتێ باسی بەهای شیعرەکانی دەکات، وەها دەڵێ:

ئەڤ، میوە ئەگەر نە ئابدارە

کرمانجییە ئەو قەدەر ل کارە

ئەڤ، طفلە ئەگەر نەنازەنینە

نەوبارە ب من قەوی شرینە

ئەڤ، میوە ئەگەر نە پڕ لەذیذە

ئەڤ، طفلە ب من قەوی عەزیزە

مەحبووب و لباس و گوشوارە

مولکێ د منن نەموستەعارە

ئەلفاظو مەعانی و عیبارات

ئینشاءو مەبانی و ئیشارات

مەوضووع و مەقاصیدو حیکایات

مەرمووزو مەناقیب و دیرایات

ئوسلووب و صیفات و مەعنا و و لەفظ

ئەصڵەن نەکرن مە یەك ژ وان قەرض

بیلجوملە نەتایجی دفکرن

دووشیزە و نەوعەرووس و بیکرن

یا ڕەب مەدە دەستێ خەلق ناساز

ڤێ شاهید دلڕوبای طەنناز

خانی کاتێك باسی خۆیشی دەکات، ئەمانە دەنووسێ:

ئەز پیلەوەرم نە گوهەریمە

خودڕەستەمە ئەز، نەپەروەریمە

کرمانجم و کووهی و کەناری

ڤان چەند خەبەرێد کوردەواری

ئیمضا بکن ئەو ب حوسن ئەلطاف

ئیصغا بکن ئەو ب سەمع ئینصاف

سەهوو و غەلەطان نکن تەعەجوب

تەئویل بکن ژ بۆ تەعەصوب

لێرەدا چەند پاراگرافێکی کتێبی فەرهەنگی دیپلۆماسی نووسینی ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ بەڕێز ڤاسیلی نیکیتین لەسەر چۆنیەتی دەرکەوتنی کێشەی کورد بە نموونە دەهێنینەوە:

سەرڕای ئەوەی کە کێشەی کورد لە مەیدانی سیاسیی ناونەتەوەییدا جێگەیەکی تایبەتی بەخۆی هەیە، لەمەودوا ناتوانرێ نکوولی لە هەبوونی ئەم کێشەیە بکرێ.

بەر لەوەی بچینە سەر ناوەڕۆکی باسەکەمان، پێویستە بڵێین: تەنانەت لە سەردەمێکیشدا کە وشەی کورد لەگەڵ جووڵانەوە پان ئیسلامیەکان و بزووتنەوەی گەورەی ئەرمەندا دەهاتەوە یاد، دیسان لە دۆسیەی وەزارەتەکانی داددا و تا ئاستێکی بەرز چاوپۆشی لە کێشەی کورد کراوە.

بە کورتی، قۆناغە گرنگەکانی پێشکەوتنی کوردان بەپێی خوارەوەن.

مێژووی مۆدێرنی کورد بە سێ قۆناغ دابەش دەکرێت:

**١- قۆناغی فیۆداڵیتەی کورد.**

---

بەرلە تەواوکردن دوو دێڕی شاعیر وەردەگێڕینەوە کە باس لە تێکۆشان بۆ سەربەخۆیی کوردستان دەکات:

حاصڵ کوو دنیا ب شیرو ئیحسان

تەسخیر دبت ژ بۆ وی ئینسان

*وەرگێڕ:

(لەم پەراوێزە درێژەدا کەڵك لە ئەحمەدی خانی، مەموزین (وەرگێڕراوی تورکیی محەمەد بوز ئارسلان، بڵاوکردنەوەی دەنگ -ئەستەمبووڵ، ١٩٩٦)و کوردستان کۆلۆنیای نێودەوڵەتیی ئیسماعیل بێشکچی وەرگیراوە).

لەگەڵ ئەوەی کە فیوداڵیتەی کورد بەشێوەیەکی ئاشکرا نارەزاییەکانی خۆی دەردەبڕی، بەڵام لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیداو کاتی سوڵتان سەلیمی یەکەم بەدواوە، خۆی لەگەڵ واقیعی سەرپەرشتیدا گونجاندبوو.

٢- ساڵی ١٨٤٧ لەگەڵ تێکچوونی هاوسەنگیەکانو ڕووخانی میرنشینی بۆتاندا، وەکوو دوایین میرنشینی فیۆداڵی کوردی، ئیدی فیۆداڵیتەی کورد بەشێوەیەکی ئاشکرا بەرامبەر بە دەست تێوەردانی بەڕێوەبەرایەتیی عوسمانی ڕاوەستاو، بە مەبەستی ڕێگرتن لە کاری تێکدانی پێکهاتەی خۆی، دەستی بە سەرهەڵدان کردو، بەو جۆرە زنجیرەیەك ڕاپەڕینی خوێناویی دەست پێکرد. پێویستە بوترێ، پان ئیسلامیەکەی عەبدولحەمیدو ریفۆرمی ژۆن تورکەکانیش توانایی چارەسەری ئەم کێشەیەیان نییە.

٣- دوای یەکەم شەڕی جیهانی (پەیمانی ڕووسیاو فەرەنسا ١٩١٦)، هەندێك لە بەشەکانی کوردستان، لە ڕووی خاكو دەسەڵاتەوە، تووشی گۆڕانکاری بوو. لە میانەی ئەمانەشدا، لەنێو کۆمیتەکانی کورددا دەستبژاردەیەك دروست بوو کە پێکەوە بەرەو ئایدیالێك هەنگاویان هەڵدەگرت. ئەمانە مۆری خۆیان لە جووڵانەوەی مۆدرێنی کوردی سەردەم داو، ئامانجی هاوشێوەی شۆڕشی گەورەی فەرەنسایان کرد بە ئایدیالی ڕزگاریی خۆیان[٤].

---

[٤] فەرهەنگی دیپلۆماسی ساڵی ١٩٣٣ لە دوو بەرگی ئەستووری (A-L-M-Z)دا بە یارمەتیی ئاکادیمیای دیپلۆماسیی جیهانی بڵاوبوەتەوە. ئەم ڕێکخراوە کە هەشت ساڵی خۆی تێپەڕ دەکات، دەیەوێ بەشێوەیەکی هاوبەش لە کێشە

سـێهەمین قۆنـاغی جوولانـەوەی کـوردی، سـەردەمی سـوڵتان عەبدولحەمیدی دووهـەمو ساڵی ١٩٠٨و دوای ڕاگەیانـدنی دووهـەمین حکوومـەتی مەشـرووتە، دەرکەوتـە مەیـدان. هـەر لـەم کاتەنەشـدا، کۆمیتـەکانی کـورد لـە ئەسـتەمبووڵو کوردسـتان پێـك هـاتنو بنـەمای ڕێکخستنی خۆیان دامەزراند. بەلام ئەم ئازادییـەیان زۆری نەخایانـدو، ئیتیحادچییەکان کـە لـە چیاکانی (ڕۆم ئێلـی)دا باوەشـی خۆیـان بـۆ مـەلاکانی بۆڵگـاریو پاپاکـانی یۆنـان کردبـوەوە، ڕووی ڕاسـتەقینەی خۆیان نیشان داو بەرامبەر بە غـەیرە تورکەکان دەسـتیان بـە هێـرشو پەلامار کرد. لە ڕێگـەی چەمکی فاناتیزمی شۆڤێنسـتانەی خۆیانـەوە، هـەموو ڕێکخراوێکـی ناتورکیـان لـەناوبردو بـە خـوێنو شمـشێر سـەرکوتیان کـردن. جـێی وتنـە، ئـەم وەزعـە تـاوەکوو شـەڕەکەی ساڵی ١٩١٨ هەر بـەو شێوەیە بەردەوام بوو. لەگـەڵ یەکـەم شـەڕی جیهانیـدا، قۆناغێکی تازەی ڕزگاری بۆ نەتـەوە بـچووکە ستەمدیدەکانیش دەسـتی پێکـرد، یـان بەشـێوەیەکی ڕاسـتتر، مرۆڤـە نیازچـاکەکان وەهـا بیریـان دەکـردەوە: هێـزی هاوپەیمانـەکان کـە سـوپاکانیان بـۆ بەرقـەرارکردنی ئاشـتیو ئاسـوودەیی‌ی مرۆڤایـەتیو ڕزگـاری‌ی نەتـەوە بـچووکەکان هێنـابوە هەرێمەکـەو دەسـتیان وەردابـوە کاروبارەکـان، بـەو ئەندازەیـە

---

جیهانیـەکان بکۆڵێتـەوە. ناوەندەکـەی لـە "bisde I Avenue HocHe, paris vII" دایـەو توانیویـەتی تـاوەکوو ئێـستا ٥١٤ بـاڵوێزی گـەورەو وەزیـر لـە دەوری یـەك کۆبکاتـەوە. ٤٣ کەسـی ئەمانـە، وەزیرانـی کـاری دەرەوەن کـە لـەنێو کەسـە هەڵبژێراوەکانی ٧٣ وڵاتدا هاتوون. ئاکادیمیا، بۆڵتەنێك بە شێوەیەکی بـەردەوام سەبارەت بە دانیشتنەکانی خۆی بڵاودەکاتەوە.

سەرکەوتوو بوون کە لەباتی بەستنی پەیمانی دوولایەنە، بڕیارەکانی خۆیان بسەپێنن. لەلایەکی تریشەوە، دوای شەڕی چوار ساڵە کە مرۆڤایەتیی تووشی ئازارێکی زۆر کردو هێشتا شوێنەوارەکانی لەسەر جەستەی مرۆڤایەتی بەدی دەکرێن، ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان بە مەبەستی بەرپاکردنی ئاشتیو ئاسوودەییی مرۆڤایەتی کە لە نوێنەرانی وڵاتە شارستانیەکان پێك دەهات، دروست بوو. ئەم ڕێکخراوە، لە ئەنجامی بۆچوونێکی مرۆڤانەوە دامەزراو، لە باری پرنیسپەوەو بەشێوەیەکی تایبەتی ئەرکی پاراستنی مافو ئازادیی نەتەوە بچووکەکانی گرتە ئەستۆ، ئەوانەی کە لەژێر دەسەڵاتی نەتەوەکانی تردا ژیان دەبەنە سەرو هەر ڕۆژ دەبن بە قوربانیو سووکایەتییان پێ دەکرێ. لەڕاستیشدا، هەر لەگەڵ تەواوبوونی شەڕدا، هێزە سەرکەوتوەکان ئەوەیان لە لێدوانەکانی خۆیاندا ڕاگەیاندبوو کە لەمەبەدوا ناهێڵن هیچ نەتەوەیەك لەژێر دەسەڵاتی ئەوی تردا بیو، لێرە بەدواوە هەر کەس دەبێ بە خاوەنی خۆیو مافی چارەی خۆنووسینی دەبێ.

بەڵام دواتر ئەوە دەرکەوت کە لێدوانەکانی سەرەوە بە مەبەستی بەدیهێنانی مافو ئازادیی گەلان نەبوەو، تەنیا بە ئامانجی بەدەستهێنانی دەسکەوتی شەڕ وەکوو کرێی شەڕی چوار ساڵە بووە.

دوای ئەوەش، چارەنووسی گەلە ستەمدیدەکان تەنیا لەڕێگەی بەرژەوەندی سیاسیی هێزە سەرکەوتوەکانو هێزە داگیرکەرەکانەوە دیاری کرا. بەرژەوەندی هێزە هاوپەیمانەکان لە سەرەتای شەڕدا وای دەویست کە ئەم هێزانە خۆیان بە کوردانەوە سەرقاڵ بکەن. هەر

ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی کە بەشی کوردستان لە پەیمانی سیڤەر (sevrs) دا بنووسرێ .بەڵام دواتر، بەتایبەت لەدوای پەیمانی ڕووسیا- تورکیاوە کە کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر سیاسەتی هێزە هاوپەیمانەکان لە ڕۆژهەڵاتدا دانا، هاوپەیمانەکان، بەرامبەر بە کێشەی کورد گوێی خۆیان خەواندو، کوردان و ئارەزوە نەتەوەییەکانیان لەبەردەم ئینسافی ئەنقەرەدا بەتەنیا هێشتەوە. حکوومەتی ئەنقەرەش بەشێوەیەکی بەرنامەبۆدانراو دەستی بە کوشتاری کوردان کردو، کوردبوونی کوردان و تورك نەبوونی ئەوانی پێ قەبووڵ نەدەکراو هیچ جۆرە بەخشندەییەکی لەخۆ نیشان نەدەدا.

لەڕاستیشدا تورکیا زۆر لەمێژبوو سیاسەتی لەناوبردنی بەرامبەر بە کوردان پێڕەو دەکرد. بەڵام ئەم سیاسەتە ساڵی ١٩٠٨و کاتی دەسەڵاتداریی ژۆن تورکەکان بەشێوەیەکی سیتەماتیك و پێداگرانەتر پێڕەوی دەکرا.

حکوومەتی ئەنقەرە، سەبارەت بەو ئامانجەی خۆی، کارە ئەنجامدراوەکانی ناتەواو دەبینی و زیاتر پێداگریی دەکردو، دواجاریش بە دەرکردنی ئەم یاسایە لەناوبردنی تەواوەتی و توانەوەی نەتەوەییی کوردانی خستنە ناو بەرنامەی کاری خۆیەوە. شایانی باسە، دووساڵ بەر لە دەرکردنی ئەم یاسایە، نەتەوە یەکگرتوەکان لیژنەیەکی تایبەتی بۆ پاراستن و چاودێریکردنی مافی کەمینەکان لەنێو وڵاتانی ئەندامدا پێك هێنابوو. بەڵام حکوومەتی تورکیا، بەرامبەر بەوە، ئەو یاسایەی دەرکردو لە ڕاگەیاندنەکانی خۆیدا بەشێوەیەکی فەرمی بڵاوی کردەوەو هەوڵی جێبەجێکردنیی دا.

وەکوو دەزانرێ، کاتی وەرگیرانی تورکیا لە نەتەوە یەکگرتوەکان، هیچ وڵاتێکی ئەندام باسی کێشەی کەمینەکانی ناو تورکیا نەکرد[٥] ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە بەرژەوەندی هێزە گەورەکان نەیدەویست حکوومەتی ئەنقەرە بخرێتە ژێر فشارەوە.

ئیتحادچییەکان و (کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی) پێشترو لەکاتی خەلیفە محەمەد ڕەشاددا یاسایەکیان بۆ دوورخستنەوەی کوردان لە خاکی باوو باپیرانیان بە مۆری خەلیفە دەرکردبوو.

سەروبەندی شەڕ، دوای ئەوەی کە حکوومەتی ئیتیحادو تەرەقی هەوڵی لەناوبردن و پاکتاوی نەژادیی ئەرمەنەکانی دا، دەستی بە جێبەجێکردنی یاسای تایبەت بە دوورخستنەوەی کوردان کرد. بەگوێرەی ئەم یاسایە، کوردان لە وڵاتی خۆیان دەردەکران و لە پارێزگا تورکنشینەکاندا جێگیر دەکران. کوردەکانیان بە ئەندازەی ٥٪ی ژمارەی دانیشتوانی تورکی

---

[٥] ئاشکرایە هەلومەرجی کەمینەکان، بۆ ئەو کەسانەی کە تازە دەبن بە ئەندامی کۆمەڵە، مەرجێکی هاوکارییە. وەکوو ئەوەی کە نیکتین لە بابەتەکەی خۆیدا بە ناوی فەرهەنگی دیپلۆماسییەوە ئاماژەی پێکردووە ((دەمانەوێ هیوادار بین کە حکوومەتی ئەنقەرە، وەکوو هێزی زاڵ بەسەر بارودۆخەکەدا، بەدوای چارەسەری ئاشتیانەدا دەگەڕێ و هەبوونی ئینتکیی نەتەوەی کورد لە چوارچێوەی بۆچوونە ئەمڕۆییەکاندا لەبەرچاو دەگرێ، چونکە کێشەی کورد شایستەی ئەمەیە. گومان لەوەی کە بەرپەرچدانەوەی چەکداری ناگاتە ئەنجام، شتێکی لەجێی خۆیدایەو، ئەگەر ڕۆژێك تورکیا داوای ئەندامێتی لە نەتەوە یەکگرتوەکاندا بکات، لەوە دڵنیام کە بەگوێرەی کۆبوونەوەی ژنێڤ چاوێك بە وەزعی هەموو کەمە نەتەوەکاندا دەخشێنێتەوە)).

گونـدەکانیان، لـەو گوندانـەدا جـێگیر دەکـرد. هـەروەها پێویـست بـوو پیاوماقووڵان‌و بەگە کوردەکان لەنێو شارە تورکنشینەکاندا نیشتەجێ بن‌و، پەیوەنـدی لەگـەڵ یـەکتری‌و کوردەکـانی تـردا دروست نەکـەن. دۆسیەکانی بەرپێوەبەرایـەتـی‌ی کـۆچ‌و جێگۆڕکـێ لـە ئەستەمبووڵ، ئـەوە دەردەخـەن کـە زیاتر لە ٧٠٠٠٠٠ کورد لە وار و زێدی خۆیان دوورخراونەتەوە.

دوای شـەڕی جیهـانی‌و هـەتا بـەر لـە پـەیمانی لـۆزان، تورکیا خـۆی بەرامبەر بە مەترسی‌ی دۆڕاندنی بوونی نەتەوایەتی بینیوە، بۆیە کاری دوورخستنەوەی کوردانی ڕاوەستاند، (خـۆی دەسـتی پـێکردو خۆشـی ڕایوەستاند).

زۆربـەی ئاوارەکراوەکـان کـە هـیچ بـەرخۆدانێکیان لـە ئاسـتی ئـەم دوورخـستنەوەیەدا نیـشان نـەدەداو، نەیانـدەزانی لەڕاسـتیدا بـە چ مەبەسـتێکی بـێ‌خێر دووریاندەخەنـەوەو، وایانـدەزانی ئەمـە لەبـەر هەلومـەرجی شـەڕە، لەڕێگـە بـە برسـێتی‌و مانـدوویێتی ژیـانی خۆیانیـان لەدەست دا. جێ‌ی باسە، بەشێکی ئەمانەش لەلایەن هێـزی جەندرمـەوە کوژرابـوون، ژمـارەی ئـەو کەسانەشـیان کـە دەیـانتوانی دوای شـەڕ بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی دایك، زۆر کەم بوون.

لە میانەی شـەڕدا، کوردەکـانیش وەکـوو هـەموو نەتـەوەکانی تـر، بـۆ بەدەسـتهێنانی مـاف‌و ئازادیـەکانی خۆیـان، لـە کۆنفرانـسی ئاشـتیدا هەوڵ‌و تەقەلای زۆریـان دابـوو. بـەڵام دوایـی زۆربـەی ئـەو ڕۆشـنبیرانەی کە بەناوی گەلی کوردەوە کاریان دەکرد، حکوومـەتی ئەنقـەرە بـە تـاوانی خیانەت بـە نیـشتمان سـزای مـەرگی بەسـەردا سـەپاندن. شـایانی وتنـە، بەشـێکی زۆری ئـەم ڕووناکبیرانـە لەسـێدارە دران‌و، ئەوانـەش کـە

مابوونەوە، بەناچاری پەنایان بردبووە بەر وڵاتانی تر و، بەم شێوەیە ئەمانەش بوون بە قوربانییەکی تری خیانەتی ئەورووپا. کاتێ باسی خیانەتی ئەوروپا دەکەین، مەبەست ئەوە نییە کە ئەوان و هێزە هاوپەیمانەکان بۆ بەدیهێنانی مافەکانی گەلی کوردو پاراستنی ئازادیی ڕۆشنبیران ئەمانەیان داوەتی وڵاتی خۆیان کردووە. کێشەی کورد خۆی لە خۆیدا، وەکوو لە سەرەتاشدا باسم کرد، شتێکی تازە نییەو خاوەنی بنەمایەکی مێژوویییەو لە زووەوە هەیەو، ڕێکخراوە کوردیەکانیش لە ساڵی ١٩٠٨ بەدواوە دامەزراون. بۆیە کاتێك باسی خیانەتی ئەورووپا دەکرێت، مەبەست ئەوەیە کە وەکوو چۆن بەرامبەر بە زۆر نەتەوەی بچووکتریش ئەوەیان کردبوو، لەکاتێکدا بەڵێنی لەبەرچاوگرتنی کێشەی کوردیان دابوو، کوردەکانیان ڕووبەڕووی جەلادەکان کردەوەو لەگەڵ ئینسافی ئەوانەدا بەجێیان هێشتن.

ساڵی ١٩٢٥ کاتێك کوردەکان بەدوای ئەو مافانەوە بوون کە دەوڵەتە شارستانیەکان ڕایانگەیاندبوو، ئەو ئەزموونەیان بە خوێن سەرکوت کراو هەزاران ژن‌ومناڵ‌و خەڵکی بێ‌تاوان بوون بە قوربانی‌و ژیانیان تێداچوو.

ئەورووپای شارستانیش، بەرامبەر بەم کوشتارە بێ‌دەنگ مایەوە. تەنانەت هێزە هاوپەیمانەکان، بەبێ‌دەنگیی خۆیان، پارێزگارییان لە تورکیا دەکردو، تا ئەندازەی مۆڵەتپێدان بە تێپەڕینی یەکەکانی سوپای تورکیاو پێداویستیەکانی بەنێو خاکی ئەو وڵاتانەدا کە کاریان تێ‌کردبوون‌و ئەوان بەوەکالەت بەڕێوەیان دەبرد، کارئاسانییان بۆ حکوومەتی ئەنقەرە دەکرد بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکان‌و، بەو

جۆرەش بەر لەوەی کە ڕاپەڕینەکان لە هەموو شوێنێك بڵاوببنەوە، سوپای تورکیا خۆی دەگەیاندە هەرێمەکەو سەرهەڵدانەکەی سەرکوت دەکرد. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەش بکرێت کە سەرکردەی ڕاپەڕینەکان لەڕادەبەدەر باوەڕیان بەوە هێنابوو کە یەکەکانی سوپای تورکیا ناتوانن بەئاسانی لە ئاوی فرات تێپەڕن و زوو بگەنە ناوەندی کوردستان. بەڵام کاتێك یەکەکانی سوپا ڕێگەی ئاسنی سووریایان بۆ گەیشتن بە ناوەندی ڕاپەڕین هەڵبژارد، بەختی سەرکەوتنی ڕاپەڕین پووچەڵ کرایەوە.

با بگەڕێینەوە سەر باسی سەرەکیی خۆمان، یانی بابەتی یاسای دوورخستنەوەی کوردان.

لەخوارەوە ناوەڕۆکی یاساکە وەکوو خۆی دەخەینە بەردەم خوێنەران،

((دوای ئاگادارکرانەوەی پێویست سەبارەت بەم یاسایە، وەزارەتی ناوخۆ لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی ئەنجومەنی وەزیراندا، بەرپرسە بەرامبەر بەوەی کە خەڵك پابەندی کولتووری تورك و ڕێکخستنی چۆنیەتیی بڵاوبوونەوەی دانیشتوانی خاکی تورکیا بێ و وا بمێنێتەوە. بەگوێرەی ئەو نەخشەیەی کە وەزارەتی ناوخۆ ئامادەو ئەنجومەنی وەزیرانیش پەسندی کردووە، چوار گرووپی هەرێمی نیشتەجێبوون و دانیشتوان لە تورکیا دورست دەکرێن،

* هەرێمەکان:

١- هەرێمە پلە یەکەکان: ئەو شوێنانە دەگرنەوە کە زیادکردنی ژمارەی دانیشتوانی تورکیان تێدا کراوە بە ئامانج.

٢- هەرێمە پلە دووەکان: ئەو جێیانە لەخۆ دەگرن کە نیشتەجێکردنی ئەوانەیان کە وا بڕیارە بکەونە بەر تواندنەوەی نەتەوەیی، تێدا کراوە بە ئامانج.

٣- هەرێمە پلە سێیەکان: ئەو هەرێمانەن کە ئەو کەسانەی وا نایانەوێ کاریگەریی کولتووری تورکییان لەسەر بێ، دەتوانن بە ئازادیو بەبێ یاریدەی دەوڵەت تێیدا دابنیشن.

٤- هەرێمە پلە چوارەکان: ئەو شوێنانەن کە لەبەر هۆی سیاسی-عەسکەری-ئابووری-کولتووری-تەندروستی، نیشتەجێبوونیان تێدا قەدەغە کراوە.

ئەو کەسانە یاخود ئەو کۆمەڵانەی کە لەدەرەوەڕا دێنە ناو خاکی تورکیا، بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ بەندەکانی یاساکەداو بەپێی فەرمانی وەزارەتی ناوخۆ مۆڵەتی مانەوەیان دەدرێتێ.

* ئەوانەی کە پەسند ناکرێن:

ئەوانەی کە کولتووری تورکی پەسند ناکەن و پابەندی بنەماکانی نین، نەخۆش (نەخۆشیی پیس، گەڕی، بەڵەکیو...) و بنەماڵەکانیان، ئەو تاوانبارانەی کە تاوانەکانیان بابەتی سیاسیو عەسکەری نین، ئاژاوەگێڕەکان، سیخوڕو قەرەجەکان و ئەوانەی وا لە وڵات دەرکراون، ناتوانن لەنێو خاکی تورکیادا بمێننەوە.

وەزارەتی ناوخۆ دەسەڵاتی گواستنەوەی ئەو گوندانەی هەیە کە دەرامەتیان کەمەو خاکەکەیان بەرتەسکە، یا شوێنەکەیان دارستانە یا بەردیان زۆرەو، دەکرێ دانیشتوانیان کۆچبەر و هاتوو یاخود نیشتەجێی ئەوێ بن و، بگوێزرێنەوە بۆ ئەو شوێنانەی کە گونجاوتر بن. لەلایەکی ترەوە، وەزارەتی ناوخۆ دەتوانێ ئەو گوندانەی کە لە ماڵی دوور لەیەك دروست کراون، لە یەك ناوەندا کۆبکاتەوە.

ئەو کەسانەی کە گومانی سیخوڕییان لێ دەکرێت:

بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران، وەزارەتی ناوخۆ دەتوانێ پەنابەرو قەرەجەکان، بە مەرجی پابەندبوون بە بنەماکانی کولتووری تورکی، لەو شارو گوندانەدا نیشتەجێ بکات کە دانیشتوەکانی تورکن. هەروەها دەتوانێ ئەوانەی

وا گومانی سیخوڕییان لیّ دەکریّت، دووربخاتەوە بۆ سنوورە دووردەستەکان و، پەنابەرو قەرەجەکانی وڵاتانی تریش لە سنوورەکانی خاکی تورکیا دەربکات.

* خیّڵەکان:

یاسا، هیچ جۆرە کەسایەتییەکی یاسایی نادات بە خیّڵەکان. سەبارەت بەم بابەتەش، هەموو جۆرە مافەکانی خیّڵ، لە فەرمان و بڕیارو بەڵگەی جۆراوجۆردا، لابراون.

سەرۆکایەتی و ئاغایەتی و شێخایەتیی خێڵ، پشت بە کام داب ونەریت دەبەستیّ با ببەستیّ، مافی هیچ جۆرە خۆڕیّکخستنیّکیان نییە.

ماوەی بەر لە ڕاگەیاندنی ئەم یاسایە، هەموو موڵك و سامانە ڕانەگویّزراوەکانی (سەرۆك و ئاغاو شێخ)ی خێڵ، دوای جێبەجێکردنی یاساکە، دەکەونە ژێر دەسەڵاتی حکوومەت و دەبن بە موڵکی دەوڵەت.

* بەر لە یاسا:

ئەم ماڵ و موڵکە لەگویّزانەوە نەهاتوانە، بەپیّی فەرمانی حکوومەتی و ئەنجومەنی وەزیران، بەسەر کۆچەرو جووتیاراندا دابەش دەکریّن.

وەزارەتی ناوخۆ، بەپیّی فەرمانی ئەنجومەنی وەزیران، دەتوانیّ بەر لە بڵاوبوونەوەی ئەم یاسایە، سەرۆك—ئاغا-یاخود شێخی خێڵەکان و ئەو کەسانەی کە گومانی سیخوڕیی سەر سنوورەکانیان لیّ دەکریّ و ئەو کەسانەش کە لە ڕۆژهەڵاتدا دەستڕۆیشتوون، لە هەریّمە پلە دووەکاندا جێگیر بکات و لە شوێنی خۆیان بیانگویّزیّتەوە.

* ئەو کەسانەی کە زمانی دایکیان تورکی نییە:

ئەو کەسانەی کە لە دەرەوەی زمانی تورکیو بە زمانێکی تر قسە دەکەن، مافی دامەزراندنی کۆمەڵەی کرێکاران، پیشەسازان یاخود گەڕەكو گوندیان نییەو، تەنیا مەرجی دامەزراندنی ئەو جۆرە شتانەش ئەوەیە کە دەبێ تەنیا تایبەت بە هاوڕەگەزەکانیان نەبێو شتێکی گشتی بێ.

وەزارەتی ناوخۆ، بەپێی فەرمانی ئەنجومەنی وەزیران، دەتوانێ ئەو جۆرە کۆمەڵانە (تەنانەت ئەگەر پێشتریش هەبووبن) بگوێزێتەوە بۆ شوێنی گونجاو.

بیانیەکان، ناتوانن لە گوندەکاندا نیشتەجێ بن. هەروەها ژمارەی ئەو بیانیانەی کە لە شارو قەزاکاندا نیشتەجێ دەبن، پێویستە لە ١٠٪ی ڕادەی دانیشتوانی ئەوێ زیاتر نەبن و بەقەدەر ژمارەی دیاریکراو و سنوورداری شارەوانی بن.

ناوەڕۆکی یاساکە سەبارەت بە چۆنیەتیی دابەشکردنی زەوی بەسەر ئەو کۆمەڵە مرۆڤانەی وا لە شوێنی تردا نیشتەجێ دەکرێنو، سەبارەت بە یارمەتیەکانی پەروەردەی نەتەوەیی، چەندین خاڵی گرنگی تێدایە.

* بەخشینی باج:

هەندێك گۆڕانکاری بەسەر بەخشینو هەڵگرتنی باجەکاندا هاتووە.

ئەو کەسانەی کە لە دەرەوەی وڵاتەوە دێن، لە هەرێمە پلە یەکەکاندا نیشتەجێ دەبن. هەروەها ئەوانەی کە لە ناوەوەی وڵات (بە ویستی خۆیان یا بەزۆر) لەوێدا نیشتەجێ دەکرێن، لەوکاتەوەی کە ناوی خۆیان تۆمار بکەن، ساڵی یەکەم هیچ جۆرە باجێکیان لێ وەرناگیرێتو، ساڵی دووەمو سێهەم و چوارەمو پێنجەمیش ناوبەناو لە باجدان دەبەخشرێن. لەوەش جوداتر، ئەم جۆرە کەسانە پارەی تۆمارکردنی ئەو پارچە زەویانە نادەن کە بەسەریاندا دابەش دەکرێن.

شایانی باسە، کڕینی خانوو و کاری بازرگانی (کڕین و فرۆشتن)و قەرزی ئەو بابەتانە، ناکەونە چوارچێوەی ئەم بەخشینەوە.

ئەو کەسانەش کە لە هەرێمە پلە دووەکاندا نیشتەجێ دەبن، هەر دەتوانن بۆ ماوەی دوو ساڵ باجەکانیان نەدەن.

ئەو یاسایەی کە دەقەکەیمان لەسەرەوە هێنایەوە، بەشێوەیەك داڕێژراوەو بەجۆرێك نووسراوە کە ئەگەر کەسێکی بێئاگا لە باری ئەتنۆگرافیای تورکیاو بێئاگا لە کێشەی کورد بیخوێنێتەوە، دەڵێ ئەم یاسایە بێزیانەو، تاکە مەبەستی ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنێکی کولتوورییە بۆ تواندنەوەی تورکە چیاییەکان لەنێو کولتووری تورکیدا.

ئێمە لێرەدا دەکەوینە هەوڵی ئاشکراکردنی مەبەستە شاراوەکانی ئەم یاسایەو، ئەم مەتەڵە کە لەژێر پەردەی زانستیبوونی کولتووری تورکیدا خۆی شاردۆتەوە.

هەر لەبەر ئەوە، سەرەتا شیکردنەوەیەکی هەر چوار گرووپی هەرێمەکان لە جێی خۆیدا دەبێ:

١- ((هەرێمە پلە یەکەکان: ئەو هەرێمانە دەگرێتەوە کە زیادبوونی ژمارەی دانیشتوە تورکەکان (هەروەها ئەوانەش کە کولتووری تورکی پەسند دەکەن) لەوێدا کراون بە مەبەست)). لێرەدا ئاشکرایە کە دەیانەوێ خەڵکی تر لەو شوێنانەدا کە نەتەوەی تورك دەژی، نەبێ و هەمووی وەکوو تورکی لێ بێ. بەپێچەوانەوە، ناچار دەبن ئەوە قبووڵ بکەن کە کەسانی تریش لە تورکیا هەن، بە زمانی جیاواز لە تورکی قسە دەکەن. لەبەر ئەوەی کە ئیدی عەرەبستانی و ئەلبانی و بولگارستانی لە تورکیای ئەمڕۆدا ناژین، ئاشکرایە کە مەبەستی سەرەکی هەمان ئەو شوێنانەن کە کوردیان تێدا دەژی.

ئەوی‌ڕاستیش بێ کەم کەس لە کوردستاندا تورکی دەزانێ و، زمانی تورکی وەکوو زمانێکی ڕەسمی تەنیا لە هەندێك شاری کوردستاندا (کە ژمارەیان کەمە) بڵاوبووەتەوەو، گەلی کورد بەشێوەیەکی گشتی زمانی تورکی نازانێ.

## هەرێمە پلە یەکەکان، کوردستان:

٢- ((هەرێمە پلە دووەکان، ئەو هەرێمانە لەخۆ دەگرن کە ئەوانەیان تێدا نیشتەجێ دەکرێن کەوا تواندنەوەیان لە کولتووری تورکایەتیدا کراوە بە ئامانج )).

لەبەر ئەوەی بیر بۆ ئەوە ناچێ کە تورکێك لە کولتووری تورکیدا بتوێنرێتەوە، پێویستە لە دەرەوەی نەتەوەی تورکدا بەدوای ئەم کەسانەدا بگەڕێین. شیکردنەوەکانی سەبارەت بە بەندی پێشوو، ئەوەمان پێ‌نیشان دەدەن کە ئەمانە لە کورد بەدەر کەسی تر نین. دیارە بۆ تواندنەوەی نەتەوەیی کوردان، پێویستە لە وڵاتی خۆیان دوور بخرێنەوەو لە شوێنە تورك‌نشینەکاندا نیشتەجێ بکرێن. لەڕاستیدا، ئەم هەرێمانەش هەمان ئەنادۆڵ و پارێزگا تورك‌نشینەکانی تراکیان.

ئەگەر گوتنەکەشمان لەجێی خۆیدا بێ، ئەم شوێنانە دەبن بە (ئاکادیمیاکانی زانستی زمانی تۆرانی) کە بەتایبەت بۆ ئێمە (کوردان) دروست کراون.

## * هەرێمە پلە دووەکان، تورکیای نەژادی:

٣- ((هەرێمە پلە سێیەکان ئەو جێگەیانە دەگرنەوە کە کۆچەرە تورکەکان دەتوانن بەبێ یارمەتیی دەوڵەت و بەرپرسانی حکوومی لەوێدا نیشتەجێ بن)).

حکوومەتی ئەنقەرە، تورکە کۆچەرەکان بە ئیمکاناتی خۆیانەوە دەباتە ئەو شوێنانەی کەوا کوردەکان چۆڵیان کردوون (پێیان چۆڵ کراوە). حکوومەت ڕێگە بە نیشتەجێبوونی کوردە کۆچەرەکان لەم هەرێمانەدا نادا، بەڵام بە لێبوردەیی و سنگ فراوانییەوە دەروازەکانی ئەم هەرێمە بەڕووی هەموو تورکەکانی دنیادا کە دەیانەوێ بە ئیمکاناتی خۆیانەوە لەوێدا جێگیر بن، دەکاتەوە.

* هەرێمە پلە سێیەکان، کوردستان:

٤- ((هەرێمە پلە چوارەکان ئەو شوێنانەن کە لەبەر هۆی تەندروستی سیاسی-عەسکەری- کولتووری- ئابووری نیشتەجێبوونیان تێدا قەدەغە کراوەو چۆڵ دەکرێن)).

ئەو شوێنانەی کە لەبەر کەش و هەوای دژواری خۆیان، دەرفەتی ژیانیان تێدا زۆر کەمەو تەنیا خەڵکی خۆجێیی دەتوانن لەوێدا بژین، لەلایەن کوردەکانیشەوە چۆڵ دەکرێن. کۆچەرە تورکەکان ناتوانن لێرەدا بژین و هەموویان دەمرن. بۆیە مانەوەی هەموو کەسێك لەم هەرێمانەدا، بە هەموو شێوەیەك قەدەغە دەکرێ.

* هەرێمە پلە چوارەکان، کوردستان:

شیکردنەوەی مەتەڵی "کولتووری تورك"و "گرووپی هەرێمەکان" بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە لەڕاستیدا لێرەدا تەنیا

دانیشتوانی هەرێمەکانی ١ و٣ و٤ ئەو خەڵکانەن کە کولتووری تورکییان نییەو کوردەکانن.

هەرێمە پلە دووەکانیش ئەو شوێنانەن کە تورکەکان تێیاندا نیشتەجێن و، هەندێك هەرێمی ئەورووپا و ئاسیاش لەخۆ دەگرن. هەرێمەکانی ١ و٢ و٣ و٤ لە کوردەکان پاك دەکرێنەوە. خەڵکی تورك لە هەرێمەکانی ١ و٣دا، لەباتی کوردەکان، نیشتەجێ دەکرێن و، کوردەکان لە هەرێمە پلە چوارەکانیشدا دەردەکرێن و دوور دەخرێنەوە، بەڵام هیچ کەسی تر لەو شوێنانەدا نیشتەجێ نابێ و مۆڵەتی یاسایی بە هیچ خەڵکێك نادرێ. ئەوی دەشمێنێتەوە، هەمان هەرێمە پلە دووەکانە کە پارێزگا تورکنشینەکان دەگرنەوەو، کوردەکانیش لەوێ بڵاودەکرێنەوەو نیشتەجێ دەکرێن [٦].

---

[٦] سیستەمی دوورخستنەوەو بڵاوەپێکردنی کوردان، ڕابردوویەکی مێژوویی خۆی هەیە. چاومان بە نموونەی سەیر دەکەوێ لە مێژووی ئیمپراتۆریای عوسمانیدا.

"Schriften and Deuk Würdigkeien des General –Feldmarschall Grafen Helmot von Moltke, Berlin 1992. BandII : Vermischte Schriten Zur Orientalischen Frage. Das Land and Volt den Kurden"

مارشاڵ گراف هەلموت لە بەرهەمێکیدا بەناوی "خەڵك و وڵاتی کوردەکان"ـەوە هەندێك پاراگراف دەهێنینەوە: ئەم مارشاڵە کە چوار ساڵ لە سوپای عوسمانیدا خزمەتی کردووە، بەم شێوەیە باسیئەوە دەکات کە سەد ساڵ بەر لە ئێستا بە چ جۆرێك ویستوویانە کوردەکان لە وڵاتی خۆیان دوربخەنەوە:

((ساڵی ١٨٣٨ کاتێ حافز پاشا بە ئاگرو شمشێر لە چیای کارزان (خەرزان: میرنشینێکی کۆنی کوردییە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا) پەلاماری کوردەکانی داو ژیانی لێ حەرام کردن. سەرو سەکوتی ڕیش چەرمووەکان لەبەر

حکوومەتی تورك دوای ساڵی ١٩٢٥، بە هەمان دیدی بەڕێوەبەراتییەوە، تورکیای کرد بە دوو بەشی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، یاخود هەرێمە تورکنشین و هەرێمە کوردنشینەکان. سنوورەکانی ڕۆژهەڵات، یاخود هەرێمە کوردنشینەکان، تا ئێران و قەفقاسیاو

---

چادرەکەی حافز پاشادا پەیدابوون، بۆ ئەوەی لە خەڵك خۆش ببێ. بەڵام پاشا بۆ ئەوەی ئەم خەڵکە بکات بە کەسانێکی گوێڕایەڵی بابی عالی، پێویست بوو ئەوان لە چیا سەرکێشەکان دابەزێنێ و لە دەشتەکاندا جێگیریان بکات. کەوابوو پاشا بەڵێنی ئەوەی پێدەدان کە دە قاتی ئەو زەوییەی لە چیاکاندا هەیانە، زەوییان لە دەشتەکاندا بداتێ. دیارە پاشا لەوە ئاگادار بوو کە بەرنامەکەی پێویستی بە بەخشندەییەکی زۆر هەیە. لە هەمان کاتدا، بەڵێنی بەخشینی باجی سێ ساڵیشی پێ دەدان. هەروەها باسی ئەوەشی بۆ دەکردن کە دەتوانن لە دەشتەکاندا لەباتی شوانی، کرمی ئاوریشم و ئەسپ بەخێوبکەن و، لەو بارەیەوە یارمەتییان دەدات. بەڵام بەمجۆرە پێشنیاری ئەوەی دەکرد بۆ ماسییەك تۆڕێك بۆ خۆی دروست بکات و خۆی بخاتە داوەوە. ڕیش چەرمووەکانیش بە چاوێکی گوماناوییەوە سەیری ئاسمانیان دەکردو پەسنی ئەو شتانەیان دەدایەوە کە داوایان لێکرابوو. بەخەڵاتەوە گەڕانەوە لای بنەماڵەکانیان و باسی هەموو شتێکیان بۆ ئەوانیش گێڕایەوە.

لەو جێگەیانەی کە ئەوانە بۆیان دەگەڕانەوە، ژنان و منداڵانیش چەکیان بەدەستەوە بوو. ئەمەش دووبارەبوونەوەی کوشتارەکانی دەگەیاندو، هەتا سەرکوتکردنی تەواوەتی ڕاپەڕینەکان کۆتاییان پێنەدەهات. بەڵام کاتێك ئەوە دەرکەوت کە نیشتەجێکردنی کوردان لە دەشتەکانداو پرۆژەی داگیرکردنی کوردستان سەرناگرێ، ئەوێیان بەجێهێشت. ئەگەر حافز پاشا لەم جارەدا توانیی جاروبار بۆ ماوەی کورت سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، تەنیا هۆی ئەمە ئەوە بوو کە کوردی بەرامبەر بە کورد بەکار هێناوە)).

چیاکانی سیواس و هەرێمەکانی خارپووت و مەلاتیە درێژ دەبنەوە. هەرێمی ڕۆژئاواش، لە یەکەم هەرێمی ڕۆژئاواوە تاکوو تراکیا درێژ دەبێتەوەو، شوێنە تورکنشینەکان دەگرێتەوە.

جیاوازیەکانی نێوان ئەم دوو هەرێمە، بەم شێوەیەی خوارەوەن:

ڕۆژهەلات بەشێوەیەکی تایبەتی بەڕێوە دەبرێ، هیچ کەسێك تەنانەت تورکەکانیش (یاخود هەڵگری ڕەگەزنامەی تورکی) ناتوانن بەبێ مۆڵەتی یاسایی وەزارەتی ناوخۆ لە ڕۆژئاواوە دەربازی دۆزەخی ڕۆژهەلات ببن. بەڕێوەبەرایەتی ڕۆژهەلات، هەمیشە لە حاڵەتی نائاساییدایەو، لەلایەن چاودێرێکەوە بەڕێوە دەبرێت. تەنانەت فەرمانبەرێکی ئاسایی دەتوانێ زیندانیە کوردەکان کە لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر دەبرێن، بدات بە کوشتن، یانی فەرمانی کوشتنیان بدات و لەرێگەی جەندرمەکانەوە بیانکوژێ.

سەبارەت بە ڕێ‌وشوێنە تایبەتەکانیش، دەتوانین بڵێین کە ژمارەی دەزگا پەروەردەییەکان لە ڕۆژهەلات، یاخود کوردستان، ئەم سالانەی دوایی لە کەمترین ئاستی خۆیدایە (ژمارەیان کەم کراونەتەوە). هەر دوای ڕاپەڕینەکەی سالی ١٩٢٥، حکوومەتی ئەنقەرە سیاسەتێکی پێچەوانەی ئەمڕۆی سەبارەت بە پەروەردەی نەتەوەیی پێڕەو کردبوو.

حکومەت دوای ڕاپەڕینەکە، بە مەبەستی تواندنەوەی نەتەوەیی کوردان لەنێو کولتووری تورکدا، زیادکردنی ژمارەی قوتابخانەکانی لە کوردستاندا وەکوو پرنسیپ قەبووڵ کردبوو. بەلام ئەو لاوە کوردانەی کە لەوێدا بە زمانی تورکی پەروەردەیان دەبینی، لەباتی ئەوەی ڕێگەی پان تورانیزم بگرنە بەر، بەپێچەوانەوە ئاگایی و هۆشیاریی

نەتەوەییی خۆیان قووڵتر کردەوەو بەهۆی ئەو زانیاریانەوە کە فێریان بوون، ئەو کەسانەی کە تا دوێنێ خوێندەوارییان نەبوو، هەندێك ڕاستیی تا ئەو ڕۆژە نەزانراویان بۆ دەرکەوت.

عەشقی وڵاتو بەخۆنازینی نەتەوەیی، بۆ هەموو نەتەوەکان یەك شتە. لاوە کوردەکان لە کتێبە تورکیەکانەوە فێری ئەوە دەبوون کە پێویستە شەیدای وڵات بنو شانازی بە نەتەوەکەیانەوە بکەن. ئەوان حەزیان لە هی خۆیان دەکرد، یانی نیشتمانی کوردانیان خۆش دەویستو شانازییان بە نەتەوەی خۆیانەوە، یانی بە نەتەوەو کولتووری کوردەوە، دەکرد.

بەرامبەر بەم وەزعەش، حکوومەت دەستبەجێ پلانی پەروەردەی نەتەوەیی لە کوردستاندا گۆڕی. بەگوێرەی ئامارەکانی وەزارەتی پەروەردەی نەتەوەیی، ژمارەی خوێندکارانی پارێزگا تورکنشینەکان ٣٣٪ ی ژمارەی دانیشتوانی ئەوێیەو، بەرامبەر بەوەش ئەم ژمارەیە لە کوردستان تەنیا ٢١,٥٪ ی ژمارەی دانیشتوانیەتی.

ئۆپەراسیۆنی پاکتاوی نەژادیی کوردەکان، بەپێی نەخشەی تواندنەوەی کولتووری، لە هەرێمە باسکراوەکاندا بەڕێوە دەبرێ. کوردەکان لە هەرێمی ڕۆژهەڵات دوور دەخرێنەوەو، لەو شوێنانە کە پێیان دەگوترێ ڕۆژئاواو تورکەکان تێیاندا نیشتەجێن، دابەش دەکرێنو، تورکەکانو کەسانی بیانیش لە هەرێمە کوردییە چۆڵکراوەکاندا، جێگیر دەکرێن.

وەکوو پێشتر باسمان کرد، کوردەکان لە هەرێمە پلە چوارەکان دوور دەخرێنەوەو، ئەو شوێنانە چۆڵ دەکرێن، بەڵام لەباتی ئەوان مۆڵەتی

مانەوەی یاسایی نادرێتە هیچ کەسێك. پڕۆژەکە هەندێك هۆی تەندروستیو سیاسی سەبارەت بەم قەدەغەیە ڕیز دەکات. هەرێمە پلە چوارەمینەکان، ناوچە شاخاویو بەردەڵانەکان دەگرنەوە، بۆیە هیچ کەسێك لەوانە بەدەر کە لەوێ لەدایك بوون، ناتوانن لەو هەرێمانەدا بژین.

دیارە ئەگەر تورکەکان لەم شوێنانە جێگیر بکرێن، هەموویان لە ماوەیەکی کورتدا دەمرن. کەوابوو ناتوانرێ تورکەکان بنێردرێنە ئەو شوێنانە. بەڵام سەرەڕای ئەوەش، پێویستە ئەو هەرێمانەی کوردستان چۆڵ بکرێن، چونکە کوردەکان لێرە دادەنیشن. هەر بۆیە پێویستە پڕۆژەکە لە ماوەیەکی کورتدا جێبەجێ بکرێت، دەنا سوپا لەکاتی ئۆپەراسیۆنە عەسکەرییەکاندا لێرە تووشی شکستی زۆر دەبێ.

یەکێك لەم ئۆپەراسیۆنانە هەمان ئۆپەراسیۆنی چیای ئاگرییە (١٩٣٠) کە زیاتر لە ٤٠٠٠٠ سەربازی تێدا بە دەستی ژمارەیەکی کەمی کوردان (مشتێك کورد) کەتبوونە تەنگانە" تا پشتیوانیی ئێرانییەکانیان وەرنەگرت، نەیانتوانی هەرێمەکە بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان. بەرامبەر بەمەش، کوردەکان توانییان دووبارە هەندێك لە سەنگەرەکانی خۆیان بستێننەوە، چونکە هێزەکانی سوپای تورك لە گەڵ داکەوتنی یەکەم بەفرو بۆراندا، بەناچاری تا چەند شوێنێکی دیاریکراو پاشەکشەیان کرد.

لەلایەکی تریشەوە، یاسای دوورخستنەوە کە ئەم خەڵکەی بە سزای مەرگ مەحکووم کردووە، فەرمانی خۆماڵیکردنی ماڵو موڵکی ئەم خەڵکە دەداتو دەیانکاتە سامانی دەوڵەتیو، لەناوبردنی ڕێکخستنی خێڵەکیش بۆ ئەم کارە، بە بەهانە دێنێتەوەو وەکوو ڕیفۆرم نیشانیدەدات.

بە چاوپێداخشانێك بە کێشەکەدا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە مەبەست لە نەهێشتنی کەسی دەستڕۆیشتوو لەناو خێڵدا، هەمان

خۆماڵیکردنی بەشێکی ماڵ و موڵکی لەگوێزانەوەنەهاتووە کە لای نەتەوە شارستانیەکان هەیە.

دیارە ئەم پڕۆژەیە بە ئامانجی لەناوبردن و پاکتاوی نەژادیی نەتەوەیەك ئامادە کراوە، سەرەڕای دوورخستنەوەی نەتەوەیەك لە وڵاتی باووباپیرانی. پڕۆژەی ناوبراو بەدوای ڕێگەیەکیشدا گەڕاوە کە ئاستەنگێك بەرامبەر بە کۆبوونەوەی (١٠ کەسی و ١٥ کەسی)ی ئەم خەڵکە لە شوێنێکدا، دروست بکات. تەنیا تاوانی ئەم گەلە بەدبەختەش کورد و ئارییایی بوون و تۆرانی نەبوونە[٧] !

یاسا، بۆ گەیشتن بە ئامانجی سەرەکیی خۆی، هەموو جۆرە ڕێوشوێنێکی پێویستی گرتوەتە بەر. بۆ نموونە، بەپێی ئەو یاسایە، لە بەشی ((ئەوانەی کە زمانیان تورکی نییە))دا، کەسانی غەیرە تورك کە لە شوێنە کوردنشینەکاندا جێگیردەکرێن (کوردەکان)، بۆیان نییە لەنێو خۆیاندا تەنانەت گرووپێکی هاوبەشی کاریش دروست بکەن. ئەمەش لەکاتێکدایە کە کوردە دەرکراوەکان (ئاوارەکراوان) زۆربەیان لە سەروەختی کۆچدا دەمرن و، ئەوانەش کە بتوانن بگەنە جێگەی خۆیان و لە کۆچەکەدا گیانی خۆیان بپارێزن، تەنیا لەڕێگەی کاری هاوبەشەوە پێیان دەکرێ پێداویستەکانی ژیانیان دابین بکەن و بمێننەوە.

---

[٧] لە چەند ساڵی پێش ئێستاوە، بەپێی بڕیاری سەرۆك کۆمار، نیشاندانی ئەوەی کە تورکەکانیش لە نەژادی ئارییایین، زیانێکی نییە. بەڵام کوردە بێچارەکان، زیاتر لەوەی کە بەپێی بڕیارنامە ئاری بن، بەگوێرەی بنەچە، نەژاد و زمانیش ئارییایین.

ئەم یاسایە، وەکوو ئەو یاسایانەی کە باسی کەمکردنەوەی سزا دەکەن، هەندێك هەنگاوی بۆ دواوەشی تێدایە. بۆ نموونە، یەکێك لە بەندەکانی ئەم یاسایە، لەوە دەدوێ کە ئەوانەی وا بە زمانی تورکی قسە ناکەنو تورك نین، مافی ئەوەیان نییە گوند ئاوەدان بکەنەوەو کاری هاوبەش دابمەزرێنن، تەنانەت ئەوانەی کە بەر لە دەرچوونی یاساکەش هەبوون، پێویستە لەناوبچنو بڵاوەیان پێ بکرێ. ئەم بەندە کە خراوەتە یاساکەوە، مەبەستی بڵاوەپێکردنی خەڵكو وێرانکردنی هەندێك شوێنی وەکوو گوندو لەوەڕگەو ... کە لەکاتی دوورخستنەوەو کۆچی بەکۆمەڵی کوردانددا بۆ شارو شوێنە تورکنشینەکان دروست کراون. حکوومەتی ئەنقەرە، بەم شێوەیە دوای ئەوەی کە ڕێوشوێنی پێویستی بۆ هەموو ڕێتێچوونێك ڕەچاو کردووە، بۆ ئەو کەسە تاكوتەرایانەش کە لە دەرەوەی ئەم وەزعانەدا ماونەتەوە، شتی پێویستی لە یاسای خۆیدا داناوە. بۆ نموونە، لە سەدەیەکدا کە شایەتیدان بەرامبەر بە هەندێك بەڵگەی بەرچاو بەهای کەمتر دەبێتەوە، حکوومەتی تورکیا لەڕێگەی ماددەیەکی تایبەتەوە (گومان)ی وەکوو بنەمای بەڵگە پەسند کردو، ئەمەشی بۆ سەلماندنی تاوانی هەر کەسێك بەکارهێناو بناغەی تاوانێکی گشتیی دانا.

* ئەو کەسانەی کە گومانی سیخوڕییان لێ دەکرێ:

لێرەدا مەبەست ئەو کەسانە نین کە کاری سیخوڕی دەکەن، یاخود بەڵگە کەوتبێتە دەست سەبارەت بەوەی کە ئەو کارەیان کردبێ، بەڵکوو مەبەست ئەو کەسانەیە کە گومانی سیخوڕییان لێ دەکرێ. مادام ئەم

تاوانـە لەڕێگـەی هـیچ بەڵگەیەکـەوە نەسـەلمێندراوەو دەسـت نیـشان نەکراوە، ئەو کاتە دەتوانرێ گومان لە هەموو کەسێك بکرێ.

بەشی کۆتایی باسەکەش، چەند لێبوردنێکی بۆ پەنابەران تێدایە، کە بە قازانجی تورکەکانەو چنگ دەنێتە بینی کوردەکان. لەگەڵ ئەمەشدا، خاڵێك هەیە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ، ئەوانەی کە لە هەرێمە پلە دووەکانداو ئەوانـەش کـە لـە هەرێمـە پلـە سـێیەکاندا نیشتەجێ دەکـرێن، بەیـەك جـۆر مامەڵـەیان لەگەڵـدا دەکرێـت. ئـەو کەسـانەی کـە لـە هەرێمـە پلـە دووەکانـدا نیـشتەجێ دەکـرێن، کوردەکـانن‌و دەیانبەنـە نێـو شـوێنە تـورکنـشینەکان" ئەوانەش کە لە هەرێمە پلە سێیەکاندا جێگیر دەبن، ئەو تورکانەن کە دەچنە هەرێمە کوردنشینەکان.

ئاخۆ هۆی ئەوە چییە کە بە یـەك جۆر مامەڵـە لەگـەڵ کوردو تورکەکانـدا دەکرێ ؟ هۆی ئەمە زۆر سادەیە: هەرێمە پلـە سـێیەکان ئـەو شـوێنانەن کـەوا لەلایـەن کوردەکانـەوە چـۆڵ دەکـرێن‌و، تورکـەکان دەتـوانن بـەبێ یارمـەتی‌ی دەوڵەت لەوێ بمێننەوە. دیارە هیچ تورکێك نایەوێ بەبێ یارمـەتی‌ی دەوڵـەت لە شوێنێکدا نیشتەجێ ببـێ کـە لـە وڵاتـی باووباپیرانیـەوە دوورە. هـەر لەبەر ئەمـەش، بـە یـەك جـۆر مامەڵـە لـە گـەڵ کوردەکـان‌و دانیـشتوە تورکـە خەیاڵییەکانی ئەم هەرێمەدا دەکرێ (چونکە تورکێك لـەوێ نابـێ، بۆیە بە یـەك جۆر مامەڵە لەگەڵ کوردو تورکـەکانی ئەوێـدا دەکرێ). پێمـان وایـە نـاوەڕۆکی یاسـا پــڕ لـــە بەخـــشندەییەکەی ! "کولتـــووری تـــورك"مـــان لەڕێگـــەی ڕوونکردنەوەکانی خۆمانەوە ئاشکرا کردبێ.

بـەڵام هاوکـات تـاووتوێکردنی بـەختی سـەرگرتنی ئـەم یاسـایە لـە بـواری مـاددی‌و دارایی‌یـەوە بێ‌سـوود نابـێ. نەخـشەکە دەکەمـەوەو

هەنـــدێك ناوەنـــد لـــەنێوان كوردســـتانو پارێزگـــا تـــوركنـــشینەكاندا هەڵدەبـــژێرم. خـــەتو دووریـــی نێـــوان ئـــەم ناوەندانـــە، بەشـــێوەیەكی گشتی، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

لـــە جۆڵـــەمێرگ (هـــەكاری)ـــەوە تـــا ئیـــزمیر (١٥٥٠كـــم)ە، لـــە (دیاربـــەكر)ەوە تـــا بورســـا (١١٥٠كـــم)ە. لـــە (بایەزیـــد)ەوە تـــا تراكیـــا (١٧٠٠كم)ە. لە (خارپووت)یشەوە هەتا گەلیبۆلو (١٢٠٠كم)ە.

دیـــارە ڕێگـــەكان، لەبـــەر ناهـــەمواری و شـــێوەی كەوانـــەییی دوورابییەكانو هەندێك هۆی ئابووریو ئیداری، درێژتر دەبنـەوە. ئەگـەر ئـەم زیـادكردنو درێژبوونەوەیـە وەكـوو چواریەك پەسـند بكـەن، ئـەوا ژمارەكان بەم جۆرەیان لێ دێ: (١٥٠٠-٢١٢٥-١٤٣٧-١٩٣٧).

بەشـــێوەیەكی گـــشتی، دووریـــی كوردســـتانو شـــارە تـــوركنـــشینەكان (١٧٥٠)ە، واتـــە -بەشێوەیەكی تـر- دوورابییەكـە هـەر كوردێكی دوورخـراوە، بۆ گەیشتن بە شوێنە تورك نشینەكان، پێویستی بە بڕینی هەیە.

بـــەگوێرەی ئامـــاری ڕەســـمـــیی تـــورك، ژمـــارەی دانیـــشتوانی توركیـــا (١٤,٠٠٠,٠٠٠ ) كەسە. پێمان وایـە ئەگـەر بڵێین (٣,٠٠٠,٠٠٠)ی ئەمانـە كـوردن، زیادەڕۆییمـان نـەكردووە. بـەم پێیـەش، ژمـارەی ئـەو كەسـانە دەركـەوتن كـە دەبـێ لـە وڵاتـی خۆیـان دوور بخرێنـەوەو ناچـارن بـڕی (١٧٥٠كم) بە ڕێگەدا بێن. ئەگەر لەگەڵ ئەمەشـدا بڕی ئەو پارەیە دیاری بكرێ كـە بـۆ سەرخـستنی پڕۆژەكـە پێویـستە، شتێكی بـاش دەبـێ. بـۆ خـوردو خـۆراكو دابینكردنـی پێداویـستیەكانی پـشوودانی هـەر تاكێك، لانی كەم (٨٧٥) فرانك پێویـستە، تـاكوو بتوانـێ (١٧٥٠كم) ڕێگـە بـبڕێ.

بەڵام ئەگەر وای دابنێین كە بەشێكی ڕێگەكەیان بە پیادەیی دەبڕنو زۆر

جار لە دەرەوەو سەر زەوی‌ی ڕووت دەخەون و خواردەمەنی‌ی خۆیان دابین دەکەن، چواریەکی ئەم ژمارەیە کەم دەکەینەوە. ئەوەی دەمێنێتەوە (٦٥٦) فرانکە، یانی (٦٥٦) فرانك بۆ هەر کەسێك پێویست دەبێ. هەروەها بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە منداڵەکان ئاسانتر دەبرێن و خەرجی‌ی خۆراکی کەمتریان هەیە، (٥٦) فرانکی تری لێ کەم دەکەینەوە، واتە دەبێ بە (٦٠٠) فرانك. کاتێ (٦٠٠) فرانك بۆ هەر کەسێك خەرج بکرێ، زیاتر لە (١٨٠٠٠٠٠٠٠٠) فرانك بۆ سێ ملیۆن کەس پێویست دەبێ. بە هەمان شێوەش، ئەگەر بۆ هەر پێنج کەسی دوورخراوە، فرانکێك بۆ بڕینی کیلۆمەترێك ڕێگە پێویست بێ، کۆی خەرجی‌ی گشتی بۆ (١٧٥٠)کم، دەبێ بە (١٠٥٠٠٠٠٠٠٠) فرانك. کۆی ئەمەو خەرجی‌ی تری دوورخراوەکانیش، دەبێ بە (٢٨٥٠٠٠٠٠٠٠) فرانك. یانی، بەشێوەیەکی تر، لانی کەم بڕی ئەم پارەیە بۆ چۆڵکردنی کوردستان پێویستە.

دیارە بۆ نیشتەجێکردنی تورکەکانی تر لەباتی کوردە دەرکراوەکان لە کوردستان، خەرجی‌ی تریش پێویستەو، دەبێ ئەوەش ڕەچاو بکرێ.

ئەگەر پێچەوانەکەشی بکرێ، ئەوا پێویستە حکوومەتی ئەنقەرە دان بەوەدا بنێ کە زیاتر لە سێیەکی خاکی تورکیای بێ‌مرۆڤ و چۆڵ هێشتوەتەوە. قبووڵکردنی ئەمەش شتێکی سەختە. جێگیرکردنی خەڵکێکی زیاتر لەباتی دوورخراوەکانی وڵاتێکی وەکوو کوردستان کە ژمارەی دانیشتوانی کەمە، بەپێی عەقڵ و مەنتیق، زۆر باشترە. بەڵام ئێمە بۆ ئەوەی هەموو ڕێتێچوونێك لەبەرچاو بگرین، وای لەقەڵەم دەدەین کە ژمارەی دوورخراوەکان و ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەباتی

ئەوان نیشتەجێ دەکرێن، وەکوو یەکە. دیارە خەرجی‌ی بارکردنی تورکەکان بۆ کوردستان لە خەرجی‌ی دوورخستنەوەی کوردەکان زیاترە، چونکە ناتوانن بە هەمان شێوەی ڕەفتارکردن لەگەڵ کوردە دەرکراوەکاندا، لەگەڵ تورکە دەعوەتکراوەکاندا بۆ خاکی کوردستان بجووڵێنەوە. بەپێچەوانەشەوە، دەبێ تورکەکان ڕازی بکەن‌و قەناعەتیان پێ بهێنن کە شوێنەکانی خۆیان بەجێبهێڵن‌و لە کوردستان نیشتەجێ ببن. لەلایەکی تریشەوە، ئاشکرایە ئەم کۆچەرانە لەنێو چیاو دەشتەکانی کوردستاندا جێگیر ناکرێن. هەتا ئەو کاتەش کە بتوانن بەرهەم بهێنن‌و ئامرازەکانی نیشتەجێبوونی خۆیان دروست بکەن، دەبێ پێداویستەکانی ژیانیان دابین بکرێن، ئەگینا مەرگ چارەنووسیان دەبێ. لەئەنجامدا، خەرجی‌ی بارکردنی تورکەکان بە دوو قاتی خەرجی‌ی گواستنەوەی کوردە دەرکراوەکان دادەنێین‌و، ئەوەش بڕە پارەیەکی (٥٧٠٠٠٠٠٠٠) فرانکی دەکات. ئەگەر ئەم پارەیەو خەرجی‌ی (٢٨٥٠٠٠٠٠٠)ی گواستنەوەی کوردان بخرێتە سەریەك، بڕی (٨٥٥٠٠٠٠٠٠) فرانك پێویست دەبێ. شایانی باسە، بڕی ئەم پارەیە بە هیچ شێوەیەك خەرجی‌ی پێداویستەکانی ئەم ئۆپەراسیۆنەو دائیرەکانی دوورخستنەوەو مووچەی فەرمانبەران‌و هێزە پاسەوانەکانی کۆچپێکردن‌و ڕێکخراوە نائاساییەکانی ئەم کارە، ناگرێتەوە.

ئەم حیسابە بچووکە ئەوەمان پێ‌نیشان دەدات کە ئەگەر کوردەکان هیچ بەرخۆدانێك لە خۆ نیشان نەدەن‌و ئامادەیی‌ی خۆیان بۆ کۆچکردن دەرببڕن‌و، بە هەمان شێوە تورکەکانیش بە ڕەزامەندی‌ی

خۆیان بیانەوێ لە کوردستان جێگیر بن، دیسان خەرجیی پێویست زەمینەی سەرکەوتنی ئەم پرۆژەیە خۆش ناکات.

چەند باوەڕهێنان بەوەی کە کوردەکان (تەنانەت ئەگەر چەکیش بکرێن) ڕەزامەندیی خۆیان بۆ دوورخستنەوە لە شوێنی خۆیان دەردەبڕن، شتێکی پڕوپووچ بێ، بە هەمان ئەندازە قەناعەتکردنیش بەوەی کە تورکەکان بە ویستی خۆیان وڵاتی باوباپیرانیان بەجێ دەهێڵن و لە هەرێمێکدا نیشتەجێ دەبن کە کەش وهەوایەکی دژواری هەیە، شتێکی پڕوپووچە.

گریمان کوردەکان وەکوو گەلەمەڕی ئارام ڕازی دەبن بە دوورخستنەوە لە چیاو دەشتەکانەوە بۆ شوێنی دووردەست، کەوابوو پێویستە جێگەی تازە بۆ نیشتەجێبوونیان پەیدا بکرێ.

ئایا گوندییەکی بێچارەی تورکی ئەنادۆڵ کە بەزۆر بە گاسنەکەی (نیڵ) خۆی نانێك دەردێنێ، ڕێ بە هاتنی کەسێکی نائاشنا دەدات کە دێت نانەکەیی لەگەڵدا بەش بکات و بخوات ؟ ئایا ئەوەندە باوەڕی بە چارەنووس هەیە ؟

هەروەها ئەو تورکانە کە لەبری کوردەکان لە کوردستان دەمێننەوە، لەکوێ و چۆن نیشتەجێ دەکرێن ؟

بۆ نموونە، با تارتارە دوبورجا (Doburca) و کریم (Krm)ـەکان و تورکەکانی ئازەربایجان لەبەرچاوبگرین، ئایا کۆچ پێکردنی ئەم مرۆڤانە بۆ شوێنێك کە ناتوانن هیچ سوودێکی لێ ببینن، شتێکی شیاوە ؟ ئەگەر ئەمەش بکرێ، ئایا دەتوانن لەگەڵ کەش وهەوای هەرێمی کوردستاندا هەڵ بکەن ؟

ئەو نموونەیەی کە ساڵی ١٩٠٢ لەسەر کۆچەرەکانی (کریت) تاقی کراوەتەوە، دەریخستووە هەرێمی کوردستان میواندۆستی، بەرامبەر بە هیچ کەسێکی تر، لە کوردەکان خۆیان بەدەر نیشان نادات و کەسی تر ناتوانێ لەوێ بژی. کۆچەرەکانی کریت بۆ ئەوەی لە ئاوی فورات نەپەڕنەوە، هەموو یارمەتیەکانی دەوڵەتیان ڕەت کردوەتەوەو بە خەرجیی خۆیان لە ئەنادۆڵ خۆیدا نیشتەجێ بوون. ئەگەر بۆ ساتێکیش وەها بیربکەینەوە کە حکوومەتی ئەنقەرە دەیەوێ بەشێکی تورکەکانی ئەنادۆڵ و تراکیا بگوێزێتەوە بۆ وڵاتی کوردان، ئەوا دەتوانین بڵێین ئەم پرۆژەیە هیچ سەرکەوتنێکی بە نسیب نابێ. کوردستان، نەك لەئەمڕۆوە، بەڵکوو لە سەدان ساڵ پێش ئێستاوە، کاتێ تورکەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە کۆچیان دەکرد بەرەو ڕۆژئاوا، نەبوو بە شوێنێکی نیشتەجێبوونیان، بەڵکوو تەنیا بوو بە ڕێگەی دەربازبوونیان و، کاتێکیش ئاوی (فورات)یان تێپەڕاند، وڵاتیان بۆ خۆیان دۆزییەوە.

شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەکانی سەرەوەمان، دەمانگەیەننە ئەنجامێکی دیاریکراو کە پشت بە ئامارەکان دەبەستێ.

بێمرۆۆ هێشتنەوەی خاکی کوردستان و ئۆپەراسیۆنی جێگیرکردنی خەڵکی تر، تەنیا بۆ تورکیایەك کە هەموودەمێك بودجەیەکی کەمی هەیە، بەڵکوو بۆ ئەو وڵاتە گەورانەش کە بودجەیەکی سیستەماتیك و ئابوورییەکی بەهێزیان هەیە، دیسان کارێکی سەخت و دژوارە.

تەنانەت ئەگەر گریمان بودجەی جێبەجێکردنی پرۆژەکەش لەئارادا بێ، دووبارە سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ. شوێنێك پێویستە بۆ چۆڵکردنی کوردستان، بەڵام ئەم شوێنە لە هیچ کوێیەك پەیدا نابێ. بە

هـەمان شـێوە، کەرەسـتە پێویـستە، کـە دەسـتیش ناکـەوێ، بـۆ پڕکردنەوەی کوردستانی چۆڵکراو.

لە ئەنجامدا، بە ئاسانی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەم یاسایە جێبـەجێ نابـێ و، پێـشبینیی چارەنووسـی کـوردانیش دەکـرێ. بێگومانیشین کە بەڕێوەبەرایەتیی ئەنقەرە ئاگادارن کە ئەو یاسایە هیچ کاتێک جێبەجێ ناکرێت. باشە کەوابوو بۆچی ئەم یاسایەیان دەرکردو بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕایانگەیاند ؟!

بێگومـان ئەمـە تـەنیا بـۆ بـە ڕاسـت نیـشاندانی دڕندایەتیـەکانی خۆیانە لە کوردستان (کە هەمیشە ئەنجامی دەدەن).ئەو یاسایە تەنیا بۆ داپۆشینی دڕندایەتیەکانیان و پاساودانەوەی بەڕێوەبەرایەتیەکەی مستەفا کەمال پاشایە لە تورکیا، بۆ بە ڕاست نیشاندانی ئەوانەیە کە بەرژەوەندیان لە مانەوەی ئەم بەڕێوەبەراتیەدایە.

پێشتر ئامارەمان بەوە کردبوو کە یاساکە لە ٥ی مایسی ١٩٣٢دا دەرچووە. ماوەیەکی کورتی دوای ڕاگەیاندنی ئەم یاسایە، جۆش و خرۆشـێك لـە هـەموو کوردسـتاندا پەیـدابوو. حکوومـەت کـە لـە ڕاپەڕینێکی تری کوردان دەترسا، دەیویست ڕای گشتی ئارام بکاتەوە. لەبەرئـەوەش لەڕێگـەی یاسـایەکەوە خـۆی بـەدرۆ نەخاتـەوە، هیـچی نـەوت. بـەڵام باس و خواسی ئـەوەی کە ئەم یاسایە هێشتا لە قۆناغی لێکۆڵینەوەدایەو دە ساڵی تر قسە لە جێبەجێکردنی دەکرێت، لەنێو خەڵکدا بڵاوکرایەوە (دەوڵەت). لەگەڵ ئەمەشدا، کۆکردنەوەی چەك لە کوردستان بەردەوام بوو، چونکە ئیدی کوردەکان ئەو مەترسیانەیان دەبینی کە هەموو ڕۆژێك ڕووبەڕوویان دەبوونەوەو، دەیانویست دەست

بەچەك بن بۆ هەر جۆرە پەلامارێكی چاوەڕوانكراوی بەرپرسانی توركیاو، بەو مەبەستەشەوە هەموو شتێكی خۆیانیان دەفرۆشت.

لێرەدا بەشە بابەتێكی ڕۆژنامەیەكی عەرەبی بەناوی "القبس"ـەوە دێنینەوە كە ڕۆژی ١٩ی ئاب بە سەردێڕی "خۆڕاگریەكانی بەرامبەر یاسای دوورخستنەوەی كوردان" و سەبارەت بە كێشەی كورد لە كۆماری توركیا بڵاوكرابوەوە:

((سێ ساڵ پێش ئێستا، حكوومەتی توركیا یاسایەكی بۆ دوورخستنەوەی كوردەكانی پارێزگاكانی ڕۆژهەلات بۆ ئەنادۆڵ و توركیاو نیشتەجێكردنی توركەكانی باڵكان لەباتی ئەوان، ئامادەكردبوو. ئەم یاسایە تائێستا جێبەجێ نەكراوە. شای ئێران كاتی سەردانەكەی خۆی بۆ توركیا، ڕێككەوتنێكی لەگەڵ بەرپرسانی ئەم وڵاتەدا سەبارەت بە كێشەی كورد لە ئێران و توركیا مۆر كرد. هەر دوای ئەم ڕێككەوتنە، حكوومەتی ئەنقەرە هەڵی جێبەجێكردنی یاساكەی قۆستەوە، بۆیە بۆ ڕێگرتن لە پەنابردنی ئەو كوردانەی وا نایانەوێ دووربخرێنەوە بۆ عێراق و سووریا، لەگەڵ هێزەكانی فەڕەنساو ئینگلتەرەدا لەسەرسنوورەكان ڕێك كەوت. دوای ئەوەی حكوومەتی ئەنقەرە وڵاتە هاوسنوورەكانی خۆی بۆ هاوكاری قایل كرد، كەوتە ئۆپەراسیۆن لە هەرێمی (بۆتان). ئەم هەرێمە چیاییە كە سنووری هاوبەشی لە گەڵ ئێران و عیراق و سوریادا هەیە، شوێنێكی زۆر گونجاوە بۆ ئەو كوردانەی هەرێمەكانی باكوور كە لە دەستی توركەكان ڕا دەكەن. بەم جۆرەش، حكوومەتی ئەنقەرە شوێنێكی ستراتیژی‌ی كوردانی چۆڵ كردو خستیە بەر خزمەتی خۆی. لەلایەكی

ترەوە، لەکاتێکدا دانیشتوانی هەرێمەکە ناچار دەکرێن خۆ ئامادە بکەن بۆ دوورخستنەوە، ئەو هێزانەی سوپای تورك کە پێشتر لە (جزیرە) بوون، ناوەندی شڕناخ داگیردەکەن. کوردەکانیش، بەرامبەر بە فەرمانی بەرپرسانی دەوڵەت، زیاتر لەوەی کە پەنا ببەنە بەر چیاو گوندە بچووکەکانی کوێستانەکان و چاوەڕێی مانەوە بن، هیچ چارەیەکیان لەبەردەم چارەنووسی خۆیاندا بۆ نامێنێتەوە. کەنعان پاشای فەرماندەی باڵی عەسکەریی دیاربەکر، خۆی بۆ خۆی چووە شڕناخ و بەرپرسیی ئۆپەرسیۆنەکەی گرتە ئەستۆ.

کاتێ ئەم فەرماندەیە چاوی بەوە دەکەوێ کە کوردەکان لە دەستی یەکەکانی سوپا ڕا دەکەن و خۆیان دەشارنەوە، ئەوسا تۆپەکانی (کە پێشتر برابوونە ئەوێ) هێنایە جزیرەو پەناگەی کوردەکانی پێ بۆمباباران کرد. لە قەزای دیجلە (؟)ی سووریا کە هاوسنووری ئەو هەرێمەیە، شەوان دەنگی تۆپ و تفەنگ دەبیسرا. تەنانەت فڕۆکەکانیش بۆ ماوەی چوارپێنج ڕۆژ بەشداریی سووتاندنی گوندەکانیان کرد. دوای ئەو بۆمبابارانە، هێزی پیادە فەرمانی پاکسازیی هەرێمەکەی وەرگرت. هەر لەوکاتەشەوە، کوردەکان و هێزەکانی سوپای تورك ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوەو کەوتنە ناو پێکدادان. کوردەکان کە مردنیان لە وڵاتی خۆیاندا لە مردن لە ڕێگەیەکی هەزاران کیلۆمەتریدا پێ باشتر بوو، بێئومێدانە شەڕیان دەکردو دوو دەستەی هێزی پیادەی سوپایان بەدیلی گرت. ئەمەش کارێکی کرد چەك و تەقەمەنییان دەست بکەوێ، کە پێویستیان پێیان هەبوو بۆ درێژەپێدانی ژیان و پاراستنی خۆیان. خێڵە دراوسێکانی تری ئەوێ

کە لەگەڵ ئەمانەدا هاووڵاتی بوون، هەستیان بە مەترسی ی سەر خۆشیان کردو بڕیاری یارمەتیدانی ئەوانیان دا.

١٥ی ئابی ساڵی ١٩٣٤، دووبارە شەڕ کەوتەوە نێوان خێڵە کوردەکان و یەکەکانی سوپای تورکیا. لەبەر ئەوەی هێزەکانی سوپا نەیاندەتوانی لە هەرێمی چیاییدا مانۆڕی باش بکەن، زیانێکی زۆریان بەرکەوت و ڕێژەیەکی بەرچاوی پێداویستی شەڕیش کەوتە دەستی کوردان.

وەکوو هەندێك لە ڕۆژنامەکان نوسیوویانە: ((ئەمە ڕاپەڕینێکی کوردان نییە، بەڵکوو خۆڕاگرییانە بەرامبەر بە بەڕێوەبەرایەتی ی ئەنقەرە کە دەیەوێ دووریان بخاتەوە بۆ ڕۆژئاوا)).

دوایین ڕستەکانی بابەتەکەی ڕۆژنامەی "القبس"، هەندێك شتی سەبارەت بە ڕاپەڕین (گوایە ڕاپەڕین)ی کوردان تێدایە، هەندێك ڕۆژنامە دەیانەوێ وەها بیبیستن.

بێگومان هەتا ئەو کاتەی کوردان بوونێکی نەتەوەیی بۆ خۆیان پەیدا دەکەن، سەرهەڵدان و ڕاپەڕین لە کوردستاندا هەبوە و دەبێ و لە ئایندەشدا بەردەوام دەبێ. بەڵام ئەو ڕووداوانەی کە ڕۆژنامەکە باسیان دەکات، هیچیان ڕاپەڕینێکی ڕێکخراوی سەرۆك خێڵەکان نەبوون، بەڵکوو خۆڕاگری و چالاکی ی خۆپاراستن بوون بەرامبەر بە بەڕێوەبەرایەتییەك کە هەمیشە و بەبێ هیچ دوودڵییەك ئامادەی کوشتاری هاووڵاتیانی خۆیەتی. ئەمە شتێکە کە یاساکانی سروشت بە شێوەی مافی ژیان و خۆشەویستی ی ژیان و، یاساکانی سزادانیش بە شێوەی پارێزگاری ی ڕەوا ناساندوویانە.

سەرانی کورد کە هەموودەم ئامادەی ڕشتنی خوێنی خۆیان و نەتەوەکەیانن بۆ ڕزگارییان، تا ئەو کاتەی هەلومەرج لەبار و ئەو

کارەش قازانجی بۆ ژیانی کوردان نەبێ، لە ڕژاندنی خوێندا زۆر هەستیارانە هەڵس‌وکەوت دەکەن. لەوەش زیاتر، ئەوە تەنیا هەلێك دەداتە حکوومەتی ئەنقەرە، کە هەمیشە ئامادەی ڕشتنی خوێنی کوردانەو تەنیا سوود بەوان دەگەیەنێ.

دیارە مرۆڤ بەئاسانی لەوەش تێدەگات کە حکوومەتی ئەنقەرە، بۆ شاردنەوەی دڕندایەتیەکانی خۆی، جاروبار ئەم جۆرە ڕووداوانەی وەکوو ڕاپەڕین نیشان داوە. بۆ ئەوەی بۆچوونێك سەبارەت بەم شتە بدەین بەدەستەوە، لێرەدا بەشێکی نامەیەك بڵاودەکەینەوە کە سەبارەت بەم ڕاپەڕینانەیە و ١٨ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٤ نووسراوە:

((چەند ڕۆژ بەر لە ئێستا، مەفرەزەیەکی بیست کەسی لە سەربازەکانی سوپا، بە مەبەستی کۆکردنەوەی چەك، سەریان لە ماڵی ئیبراهیم ئاغای برازای خوالێخۆشبوو "محەمەدی عەلی یوونس"[8] دا. خانەخوێ کاتێ چاوی بە چەکدارەکان دەکەوێ، ماڵەکەی بەجێدەهێڵێ‌و خۆی لە ماڵی دراوسێکەیان دەشارێتەوە. سەربازەکان تەقەیان لێ کردو کوشتیان. دوو خزمەتکارەکەشی کە دەیانویست لە شوێنی ڕووداوەکە ڕا بکەن، بە هەمان شێوە کوژران. کاتێ برازاو خزمەکانی ئیبراهیم ئاغا ڕووداوەکە دەبیستن،

---

[8] محەمەدێ عەلیێ یوونس "Mehmedê Aliyê ûnis"ی سەرۆکێکی دیاری خێڵاتی بە گەلی چیایی ناسراو کە لە چیاکانی ساسۆن دەژی، لەلایەن بەڕێوەبەری قەزاوە دەعوەت کرابوو بۆ نانی ئێوارە. بەڵام کاتی میوانداریەکە، بە دەستی جەندرمەکان کوژرا. شایانی باسە، دوو خزمەتکاریشی کە لە دەرەوە بە سواری ئەسپەکانیانەوە چاوەڕێی ئەویان کردبوو، هەمان شتیان بەسەردا هات‌و چارەنووسیان وەکوو یەکی لێ هات.

هەســت بــە مەترســی دەکــەن‌و چــەك هەڵــدەگرن‌و گونــد بــەجێ‌دێڵن. مەفرەزەکـەش دوایـان دەکـەوێ‌و تەقـەیان لـێ دەکـات، ئـەوانیش وەڵامیـان دەدەنــەوە. لــە ئەنجامــدا فەرماندەیــەك‌و دوو ســەرباز دەکــوژرێن. دواتــر کوردەکان پەنایان بردە بەر چیاو، بەرپرسانی حکوومەتیش (دوای بیستنی ڕووداوەکە) مەفرەزەی تریان ڕەوانەی هەرێمەکە کرد.

ئـەو شـتانەی کـە بـە ڕاپـەڕینی کوردەکـان نـاودەبرێن، ئـەم جـۆرە ڕووداوانــەن‌و، ســەرکردە کوردەکــانیش بــەوە تاوانبــار دەکــرێن کــە هاووڵاتیەکانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە.

با بچینەوە سەر باسی سەرەکیی بابەتەکە، کە بوو بەهۆی ئەوەی لــەم شــتانە بــدوێین. دوای ڕووداوەکــانی بۆتــان، فەرمانــدەی بــاڵی عەسکەریی دیاربەکر، لەبەر هۆیەکی نەزانراو، ڕۆیشتەوە دیاربەکرو ئۆپەراسیۆنەکان وەستان. وەکوو هەموو جارێکیش، ژنـان‌و پـیران‌و منــداڵان بەتایبــەتی‌و خــەڵکی بێچــەك بەگــشتی، زیــانی ئەنجامــە بێخێرەکانی ئەم ئۆپەراسیۆنانە بەرکەوت.

دوای ماوەیەکی تر، شەوی ٢٧|٢٦ی ئەیلوول لە جزیرەوە هەواڵی دەستگیرکرانی ٣٢ پیاوماقووڵی ئەو هەرێمەمان پێدەگات، کە تەنانەت ڕێگەیان پێنەدراوە دواین قسەکانی خۆیان بە بنەماڵەکانیان بڵێن‌و خراونەتە زیندان. لە هەمان شەودا ئەم ٣٢ کەسە بەرەو دیاربەکر دەبرێن. بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی کە لە شوێنە جیاوازەکانی هەرێمی جزیرەوە بە ئێمە دەگەن، هەر لەو کاتانەدا کە ئەوانە دەبەن، زیاتر لە

١٠ گۆرانیبێژیش کە بەیتو بالۆرەیان بە بالآی سەرکردە ڕاپەڕیوە شەهیدکەوتوەکاندا گوتووە، دەستگیر دەکرێن[٩].

کاتێ پیاوماقوولانی جزیرە دەگەیەننە دیاربەکر، ئازادیان دەکەنو، ڕۆژی دووهەم کەنعان پاشا لە مالّی سوپا، وەکوو ئەوەی هاوڕێی کۆنی بن، میوانداریو پێشوازیی گەرمیان لێ دەکات. لەوەش زیاتر، لەبەرئەوەی فەرماندە دەیەوێ خۆی لە چاوی ئەوانەدا شیرین بکات، ئەوانە دەعوەتی سینەمای بنەمالّەی ئەفسەران دەکات. ڕۆژی دواتر ئەم دوورخراوانە، بەبێئەوەی چاوەڕوانی میوانداریییەکی تر بن، سوپاسی خاوەن مالّە بەڕێزەکەیان دەکەنو دەگەڕێنەوە. ئەو ماوەیە کە تێپەڕ بوو، چی بوو بەهۆی ئەوەی کە بەرپرسان ناچار بکات وەها بجوولّێنەوە ؟ بێگومان مەترسیی بەرخۆدانێکی چەکدارانەو ئەگەری ڕاپەڕینێکی تر ! هەوالّی دوورخستنەوەی ئەم ٣٢ پیاوماقوولە کە بەشێکی

---

[٩] لەم ڕێگەیەوە، دەگوترێ فۆلکلۆری کوردی دەولّەمەندییەکی زۆری هەیە. زۆربەی ڕووداوەکان بە گۆرانیی جیاواز دەهێنرێنەوە سەر زمان. تەنانەت سەرکەوتنی میرنشینەکانو، ڕووداوی نێو شەڕەکانو شەڕوشۆڕی خێلّەکانو قارەمانی شەڕە بچووکەکانیش، لە گۆرانیو بالۆرەکاندا دەست نیشان کراون. هەر لەبەر ئەم هۆیەش، بۆ ئەوەی کە جارێکی تر نەگەڕێنەوە، ویستیان دووریان بخەنەوە لە ولآتی خۆیان. شیعرەکان لەڕێگەی ئەم ئەدەبیاتەوە کە سەرچاوەیان کردەوەکانی خەلّکە، لەدوای ١٩٢٥ـەوە هەموو ئەو ڕووداوانەشی تۆمار کردووە کە هاتوونەتە ئاراوە. ئەم دێڕانە کە ئەدەبیاتی میللیو بە گۆرانی دەگوترێنەوە: باسی شێخ سەعید لەکاتی گەمارۆدرانی دیاربەکردا، گیرانی خارپووت لەلایەن کوردەکانەوە، دوورخرانەوەی سەرکردە کوردەکان بۆ ولآتە بیانییەکانو هەولّدانەکانیان بۆ ڕزگاریی ولآتی خۆیان، دەکەن.

زۆری کوردستانیان بۆ گەیشتن بە دیاریەکر تێپەڕاندبوو، لە هەموو کوردستاندا بڵاوبووبوەوە. خەڵك دووبارە خرۆشابوو: تەنانەت شتی زۆر سەبارەت بە خۆسازدان بۆ ڕاپەڕینو گیانبەختکردن دەبیسترا.

حکوومەتی ئەنقەرە، سەرباری تێپەڕینی ۱۰ ساڵ بەسەر کۆکردنەوەی چەکی کوردستاندا، هێشتا لە ڕاپەڕینێکی چەکداری دەترسا، لەبەرئەوە فەرمانی گەڕانەوەی ۳۲ کەسەکەی بۆ جزیرە دەرکردو، تەنیا ڕووداوەکانی بۆتانو قوربانیەکانی بەس بوون. لەڕاستیدا یاسای جێبەجێکراوی حکوومەتی ئەنقەرە وەها ڕادەپەڕێنرێ، جاروبار پەلاماری هەرێمێکی کوردی دەدات.

هەرچەندە کۆیلایەتیی کوردان تاکوو سەدان ساڵی تریش بەردەوام بێ، دیسان ئەم سیستەمە ڕێگە بە تورکیا نادات خەڵکی کورد لەناو بەرێ. حکوومەتی ئەنقەرەش هەموودەم خەڵکێکی بێتاوان کە دەستەکانی چەك هەڵناگرن، بۆ خۆشیی خۆی، دەکوژێ. بەگوێرەی ئەو شتانەی کە باسمان کردن، یاسای دوورخستنەوە شتێکی لەوە زیاتر نییە کە بەهانەیەك بێ بۆ ستەمی زیاتری بەڕێوەبەرانی ئەنقەرە لەسەر خەڵکی کوردو، تەنیا هەلومەرجی ئەوەشیان بۆ فەراهەم دەکات. ئەوەش لەسەردەمێکدا کە کۆیلە ڕەشپێستەکانو تەنانەت ئاژاڵەکانیش لە پەلامار دەپارێزرێن.

ئەو ئامانجانەی کە سەرکردە کوردەکان بەدوایانەوەن: زۆر سادەن، ئەوەش تەنیا پێکهێنانی بوونێکی نەتەوەییە بۆ پاراستنی خەڵکی خۆیان لە هەر جۆرە پەلامارێکی دەرەکی. سەرکردە کوردەکان لە

هەموو شوێنێك تاقیب دەكرێن و، ڕێی تێدەچێ هەمووكاتێك لەمەترسیدا بن، بەڵام هیچ كاتێك بێهیوا نابن.

سەركردە كوردەكان دەزانن چییان دەوێ و، بۆ بەدەستهێنانی ئەوانەش بەبڕیارن و زۆر سادەن و، فرمێسك بۆ مەینەتی و ئازاری نەتەوەكانی تر هەڵدەڕێژن و باوەڕیان بە ((ڕاستی لەپێشكەوتنداییەو هیچ شتێك ڕێی لێ ناگرێ)) هێناوە.

لەكۆتاییدا، پاراگرافێكی فەرهەنگی دیپلۆماسیی "ڤاسیلی نیكیتین" سەبارەت بە كێشەی كورد دێنینەوە:

((وەكوو ئەنجامی ئەم شتە كورتە، دەمەوێ باوەڕی قووڵی خۆم بهێنمە سەر زمان: چارەنووسی كێشەی كورد چی دەبێ با ببێ. ئیدی ویژدانی نەتەوەكان ناتوانێ چاوپۆشیی لێ بكات و، لە باری عەدالەتەوە، پێویستە ئەم كێشەیە بەگوێرەی چەمكە هاوبەشەكانی مرۆڤایەتی كە وەكوو خەزێنەن، چارەسەر بكرێت. ئیتر دەرفەت نەماوە ئەم جۆرە هەوڵانە پووچەڵ بكرێنەوە)).

قەڵەمشاهـ

١٥ی تشرینی یەكەمی ١٩٣٤

هەرگۆڵ ئازیزان "جەلادەت عالی بەدرخان"

# لەچاپدراوەکانی " بنکەی ژین "

١. ڕەفیق سالْح، ڕۆژنامەی ژیان: ژمارە (٢٥٩-٣٢٠)، لێکۆڵینەوەی سدیق سالْح، ب٣، (٢٣×٣٤سم)، ٢٨٢ل.

٢. عبدالرقیب یوسف، پەیدابوون و دروستکردنی چەکی ئاگردار، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٤، ٧٢ل.

٣. کوردستان لە بەڵگەنامەکانی کونسلی فڕەنسی لە بەغدا سالی ١٩١٩، لە فرەنسییەوە وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵلا، ب١، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٤، ١٧٢ل.

٤. بازیل نیکیتین و کوردناسی، لە فرەنسییەوە وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵلا، ب١، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٤، ٢٧٢ل.

٥. عبدالرقیب یوسف، لە بەڵگەنامەکانی حکومەتی شێخ مەحمود: تۆمارێکی شارەوانیی سلێمانی ١٩٢٣-١٩٢٤، لێکۆڵینەوەی سدیق سالْح، (٢١×٣٣سم)، ٢٠٠٤، ٢٦٦ل.

٦. گ. گرێنڤیل، گ. س. پ. فریمان، ڕۆژژمێرەکانی کۆچی و زایینی، لە فرەنسییەوە وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵلا، (٢١×١٩سم)، ٢٠٠٤، ١١٥ل.

٧. ڕەفیق سالْح، ڕۆژنامەی ژیان: ژمارە (٣٢١-٤٠٠)، لێکۆڵینەوەی سدیق سالْح، ب٤، (٢٣×٣٤سم)، ٢٠٠٥، ٣٥٨ل.

٨. سدیق سالْح، سەرجەمی بەرهەمی عەبدولعەزیز یاملکی، ب١، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٥، ١٨٣ل.

٩. **کوردستانی عیراق لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا**، لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕانی سەلمان عەلی، ب١، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٥، ٢١٤ل.

١٠. عەبدوڵڵا زەنگەنە، ڕۆژی کورد: **گۆڤاری جڤاتی قوتابیانی کورد لە ئەستەموول ١٩١٣**، (١٧ × ٢٤سم)، ٢٠٠٥، ٤٢٠ل.

١١. ڕەفیق سالح، **یادگاری لاوان و دیاری لاوان**، لێکۆڵینەوەی سدیق سالح، چ١، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٥، ٢٢٠ل.

١٢. دکتۆر سەلاح محەمەد سەلیم هروری، **عەبدولڕەزاق بەدرخان ١٨٦٤-١٩١٨: ژیان، تێکەلیێن سیاسی، خەباتا چاندی**، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٥، ٨٤ل.

١٣. ڕەفیق سالح، **یادگاری لاوان و دیاری لاوان**، لێکۆڵینەوەی سدیق سالح، چ٢، (١٦×٢٣سم)، ٢٠٠٥، ٢٢٨ل.

١٤. ئەلیکساندەر خۆدزکۆ، **چەند لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی زمانی کوردی (دیالێکتی سلێمانی)**، لە فڕەنسییەوە وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵڵا، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٥، ١٨٦ل.

١٥. جان ر. پێری، کەریم خانی زەند: **مێژووی ئێران لەنێوان ١٧٦٤-١٧٨٩**، لە فارسییەوە وەرگێڕانی سەلاحەددین ئاشتی، ( ١٧ × ٢٤سم)، ٢٠٠٥، ٦٨٥ل.

١٦. گ. ر. درایڤر، **درایڤر و کورد: کۆمەڵی پێنج وتار**، لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕانی ئەنوەری سوڵتانی، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٥، ١٢٨ل.

١٧. سدیق سالح، **سەرجەمی بەرهەمی محەمەدئەمین زەکی بەگ، ب١**، (١٦×٢٣سم)، ٢٠٠٥، ٣٧٠ل.

١٨. الدكتور محمد علي الصويركي الكردي، الأكراد الأردنيون ودورهم في بناء الأردن الحديث، (١٧ × ٢٣,٥ سم )، ٢٠٠٥، ١٨٦ص.

١٩. شەمعی و محەمەد ئیبراهیم ئەردەلانی، دوو (ذەیل)ی شەرەفنامەی بتلیسی، ئامادەکردنی ئەنوەر سوڵتانی، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٥، ١٨٠ل.

٢٠. عبدالرقیب یوسف، تابلۆکانی شەرەفنامە، چاپی سێیەم، (١٦,٥ × ٢٣ سم)، ٢٠٠٠٥ ، ٢٧٥ل.

٢١. مختارات من كتاب الموصل وكركوك في الوثائق العثمانية، ترجمة وتعليق د. أ. خليل علي مراد، (١٦,٥ × ٢٣ سم)، ٢٠٠٥، ٣٢٥ص.

٢٢. الآثار الكاملة للمؤرخ الكردي محمدأمين زكي (مشاهير الكرد وكردستان)، الجزء الثاني، إعداد رفيق صالح، (١٦,٥ × ٢٣ سم)، ٢٠٠٥، ٤٩٥ص.

٢٣. ڕۆژهەلاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا، لەئینگلیزییەوە وەرگێڕانی ئەنوەر سوڵتانی، (١٦,٥ × ٢٣ سم)، ٢٠٠٥، ٤٦٢ل.

٢٤. نوشیروان مصطفی امین، حکومت کردستان: کردها در بازی سیاسی شوروی، ترجمه سمایل بەختیار، (١٦ × ٢٤ سم)، ٢٠٠٥، ٣٠٢ص.

٢٥. د. یاسین سەردەشتی، هەڵوێستی حزبی توودە لەحاست کێشەی نەتەوایەتی ی گەلی کورد لە ئێران (١٩٤١-١٩٨٣)، (١٤,٨٥ × ٢١ سم)، ٢٠٠٥، ١٦٠ل.

٢٦. محەمەدئەمین زەکی، تاریخی سلێمانی وە ولاتی، ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح، (١٦,٥ × ٢٣ سم)، ٢٠٠٦، ل.

٢٧. الدكتور محمد علي الصويركي، **معجم أعلام الكرد**، (٢١ × ٢٩ سم)، ٢٠٠٦، ٨٥٠ص.

٢٨. توفيق وهبي بك، **الآثار الكاملة، الجزء الأول**، (١٦,٥ × ٢٣ سم)، ٢٠٠٦، ٥١٠ ص.

٢٩. ئەنوەر سوڵتانی، **لاهووتی کرماشانی شاعیری شۆڕشگێڕی کورد**، (١٦,٥ × ٢٣ سم)، ٢٠٠٦، ٢٨٩ل.

٣٠-ڕەزای شەجیعی، **کتێبخانەی ڕۆژهەڵات**، (١٤٠٨٥×٢١)سم، ٢٠٠٦، ١٩٥ل.

٣١. ئارتوور کریستێنسێن، **ئێرانی سەردەمی ساسانییەکان**، (١٧ × ٢٤ سم)، ٢٠٠٦، ٧٠٦ل.

٣٢. جەلادەت عالی بەدرخان، **لەبلرەی کێشەی کوردەوە: سەبارەت بە دوورخستنەوەو بڵاوەپێکردنی کوردان، لەتورکییەوە وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەڵاتی**، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٦، ٥٦ ل.